**ئەم پەیامە:**

* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی تورکی دایناوە.
* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.
* (**فارووق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) لەگەڵ دەقی عەرەبییەکەدا بەرامبەری کردووە.


* چاپی یەکەم: سلێمانی ١٤٤٢ك - ٢٠٢٠ز.
* (**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**) نەخشەی بەرگی کێشاوە و بڵاوی دەکاتەوە.





* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٦٧)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# خوای گەورەم بەسە

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

دایناوە

## فارووق ڕەسووڵ یەحیا

كردوویە بە كوردی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ
إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣
فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ
وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ١٧٤﴾ (آل عمران).

# پێشەکی

مرۆڤ لە هەوراز و نشێوەکانی جیهانی نادیاری ناوخۆیدا، چەندین باری لە یەك جیاوازی "خۆبینین" ئاراستەکانی بیر و گوفتار و ڕەفتاری دیاری دەکەن و، هەریەك لەو دەرهاویشتانەش گەوهەری ئەو لەو دۆخەدا دەنوێنن.

جۆری پەیوەندییەکانی مرۆڤ لەگەڵ خواوەند و، مامەڵەی وەرگرتن و بەخشین لەگەڵ دەوروبەر و، کاردانەوەی ئەرێنی و نەرێنی بەرامبەر پێشهاتەکان، جێدەستی گرنگیان لە کارایی ئەو هەڵکشان و داکشانەدا هەیە.

هەرکام لە ئێمە هەتا ساوایە، پتر گوزارشت لە ڕاستیی تواناکانی "خود"ی دەکات و پەی بە "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی خۆی دەبات کاتێ بۆ هاتنەدیی مەبەستەکانی پشت بە چاودێریی دڵسۆزانەی دەوروبەر دەبەستێ، تەنانەت بە گریانەکەی سۆزی دایك دەبزوێنێ و تا لە ئامێزی میهرەبانیی ئەودا وچان نەگرێت خەمی دەستەبەربوونی خواستەکانی ناسرەوێ.

دواتر لەگەڵ بەرزبوونەوەی تەمەن، کردگاری دانا بەرە بەرە ئەو بەهرانەمان پێدەبەخشێت کە بۆ قۆناغەکانی پێگەیشتن پێویستمان بن. هاوکات لەگەڵ مانەوەی "لاوازی" و "دەستەوسانی"مان لە ئاستی ئەو پێداویستی و ئاوات و ئازارانەی کە بەدەر لە کێشی وزە و توانای ئێمەی هەژارن..

ئەوەش میهرەبانییەکی دیکەی بەدیهێنەرە بۆ ئەم مرۆڤەی کە بەدیهێنراوێکی نایابی خۆیەتی و، خۆشی دەوێت و، پلەی تەواو بایەخداری لەم گەردوونەدا پێ بەخشیوە و، دەیەوێت بۆ خواستەکانی هانا بۆ جگە لە بەدیهێنەری نەبات، تاکو هێڵی پەیوەندیی نێوانیان نەپچڕێت و، بێ پشتیوان و تەنیا نەمێنێتەوە و، لە سەرچاوەی هێز و وزەی ڕاستەقینە و بێسنوور دانەبڕێت.

کەچی هەندێکمان لە دەمی بێئاگاییدا، لە بریی سوپاس و بەهازانی و سوودوەرگرتن لە حیکمەتی "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی مرۆڤ، پێنەزانی لە ئاستی ئەم نیعمەتە مەزنەی بەدیهێنەر دەنوێنێت و، کاتێ پەی بەو لاوازی و دەستەوسانییەی خۆی دەبات، بە نەنگی و ناتەواویان دەبینێت و، هەوڵی شاردنەوەیان دەدات بە ڕێگا جۆراوجۆرەکانی نکوولّی و پەردەپۆشی..

زۆردارەکانی مێژوو، بە نواندنی زەبروزەنگ، هەوڵی کپکردنی زایەڵەی "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی ناخی خۆیان داوە، بێئاگا لەوەی کە هەتا پتر لە زەبر و زۆر و ناڕەواییدا پێ ڕابکێشن هەڵهاتنی خێراتری خۆیان لە سامی ئەو زایەڵەیە دەردەخەن.

خۆنواندنی هەر خاوەن چاکە و بەهرەیەکی ماددی یان مەعنەوی بەو چاکە و بەهرەیەی خوای گەورە پێی بەخشیوە و، پیشاندانی وەك ئەوەی کە بە هێزی بازووی خۆی بەدەستی هێنابێت، چەندین نموونەی دیکەی هەوڵی پۆشینی "لاوازی" و"دەستەوسانی"ی مرۆڤی هەژارمان بۆ دەردەخات.

مرۆڤ بەم چەشنە هەوڵانەی بۆ نکوولّی لەو نهێنییە، زۆر جار ژیان لە خۆی و هەندێ جار لە دەوروبەریشی لێڵ دەکات، کاتێ دان بەوەدا نانێت کە ئەو شتەی لە دەستی هەڵدێت کلیلی گەنجینەی سامانی نەبڕاوە و، ڕێی ئاسایی هێنانەدیی خواستەکانیەتی، تەنانەت هێڵی پەیوەستبوونیەتی بە سەرچاوەی هەموو وزە و هێزێکی ڕاستەقینە، بێ ئەوەی لەخۆی بایی ببێت یان لە بەرزایی پلەی مرۆڤانەی بێتە خوارەوە بۆ چاولێکەریی بەدیهاتووە دڕندەکان.

لە ڕاستیدا خوای گەورەی میهرەبان هەژاری و لاوازی و دەستەوسانی و پێداویستییە زۆرەکانی لە مرۆڤدا لەبەر ئەوە داناوە تاکو لە هەموو قۆناغ و پێویستی و ڕێ و شوێنێکی ژیاندا پشتیوانی بەندەکەی بێت و، هەر خۆی بە

هانایەوە بڕوات و، چاڵ و چۆڵ و هەڵدێرەکانی دنیا لە دەست و پێی نەخەن و، بە لاڕێدا نەبرێت و، دەرەنجام بێ پشت و پەنا نەمێنێتەوە..

خۆ هەر هێندەی مـرۆڤ لە جیهـانی ناوخۆیـدا ئەم خـاڵی پەیوەنـدییەی بە بەدیهێنەریەوە دۆزیـیەوە و، خـۆی ڕادەسـتی ئەو کـرد و، هێنـانەدیی سـەرجەم خواستەکانی بەو سپارد، ئەوا پەیوەستی وزە و هێز و توانستێك دەبێـت کە لای بەدیهێنەری نەبێت لە لای هیچ کەس و شوێنێکی دیکەدا دەستی ناکەوێ.

ئەم پەیامەی بەردەستمان جۆرە مەشق پێکردنێکە، فێرمان دەکات چـۆن لەو کانیاوە سازگار و سەرچاوە بەپیتە بنۆشـین. هەروەك ڕوونی دەکـاتەوە کە هـیچ ڕووداوێـك نیـیە بەسـەر مرۆڤـدا بێـت و ڕێگـایەکی تێـدا نەبێـت بـۆ تونـدوتۆڵکردنەوەی پەیوەنـدییەکانی نێـوان خـوای گەورە و بەنـدەکەی و، لاچوونی پەردەکـانی بێئاگـایی کە تێڕوانینەکـانی دوور لە ئـیمان و قورئـان بـۆ مرۆڤی دروست دەکەن..

تەنـانەت دەریـدەخات کە هەنـدێ لە هۆکارەکـانی بێتوانـایی مـرۆڤ لە چاکسازیی جیهانی ناوخۆیدا، پشتبەستنیەتی بە توانا و هێـزە کەموکورتەکـانی. دیارە هەوڵی لەو جۆرەش گەلێ دژوارە بە توانسـتە جوزئییەکـان سـەربگرێت، بەڵکـو پێویسـتی بە توانـایەکی سـەروو توانسـتی مـرۆڤە، ئەوەش جـگە لە دەستەڵاتی خوای گەورە شتێکی دیکە نییە.

هەروەها ئەم پەیامە خنجـیلانەیە بەرچاوڕۆشـنی بە مـرۆڤ دەبەخشـێت لە ئاستی پاڵەپەستۆکانی ژیان و، گەوهەر و ڕووی ڕاسـتیی ڕووداوە سـەختەکانی پێ دەناسێنێ.

دانەر - خوای لێ ڕازی بێت - بۆ دڵنیـاکردنەوەی خـوێنەر، خـۆی دەکـاتە نموونەیەکی ڕچەشکێن و سەرمەشق، تاکو ببێتە پێشەنگێك بۆ هەر خوێنەرێکی

بەڕێز کە بە نیازی بنیاتنانی کەسایەتیی ئیمانیی بڕواتە خزمەتی قورئانی پیرۆز و بۆ پێگەیاندنی خۆی بەهرە لە ئایەتەکانی وەربگرێت.

لەم ڕۆژگارانەدا کە بەخزمەتگەیشتنی مورشیدی ڕاستەقینە و لێهاتوو بۆ پێگەیاندنی مرۆڤ بە پەروەردەی قورئانی حەکیم دەگمەن و ئەستەم بووە، (پەیامەکانی نوور) ڕۆڵی مورشیدێك دەبینن بۆ سەرخستنی خوێنەری خوازیار بە پلەکانی ناسینی خوای گەورەدا و، بەرزکردنەوەی بۆ ئاستی سوودمەندی لە پەروەردەی خاوێنی قورئان و، توندوتۆڵکردنەوەی پەیوەندیی مرۆڤ بە خوای خۆیەوە.

خوێنەری ئامانجدار، بە خوێندنەوەی لەسەرخۆی پەیامەکانی نوور، دڵنیا دەبێ لەوەی کە مرۆڤەکان چەندە هەلی زێڕین لە دەست دەدەن کاتێ بەدەم بانگی پەروەردەی قورئانەوە ناڕۆن. بە پێچەوانەشەوە چەندە بەختەوەری هەردوو ژیان دەبن کاتێ قورئانی پیرۆز دەکەنە سەرچاوەی باوەڕ و پەروەردە و سلووك و هزر و ڕوانین و بیرکردنەوە و سەرجەم چالاکییەکانیان!

لە خوای گەورە دەلاڵێینەوە کە ئێمە و خوێنەری خۆشەویست بەو پەروەردە قورئانییە پێبگەیەنێت و، زیاتر لە ڕەزامەندییەکانی نزیکمان بخاتەوە و، بەرچاوڕۆشنیمان لە هەموو هەڵوێستەکاندا پێ ببەخشێت و، هەڵەکانمان بسڕێتەوە و، بە ئیمان و لێخۆشبوونەوە بمانباتەوە بۆ حوزووری خۆی.

وصَلَّى اللّهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنا ونَبِيِّنا محمَّدٍ وعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعين.
وَالْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِين.

فاڕووق ڕەسووڵ یەحیا

١٤٤٢/١/٤ك

٢٠٢٠/٨/٢٣ز

# تیشکی چوارەم

ئەم تیشکە لە ناوەرۆك و پـلەدا "بریسـکەی پێـنجەم"ە و، لە شـێوە و جێگەشـدا "تیشـکی بەنرخی چوارەم"ی بریسـکەی سی و یەکەمـی مەکتـــــووبی سی و یەکەمە و، بــــــریتییە لە سەرنجێکی گرنگ و مەزنی ئایەتی پیرۆزی:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ (آل عمران:١٧٣).

**بێدارکردنەوەیەك:**

شێوازی پەیامەکانی نوور وەکو هی کتێبەکانی تر نییە، چونکە لە سەرەتاوە باسەکەی هەندێ تەماوی و نادیار دەست پێدەکات کە لەوانەیە لای خوێنەر پەنهان بێت و یەکەم جار بە لایەوە ڕوون نەبێت. بەڵام وردە وردە باسەکە ڕوون دەبێتەوە و واتاکانی هێدی هێدی دەردەکەون. بە تایبەت ئەم پەیامە، کە پلەی یەکەمی گەلێ ورد و قووڵ و تەماوییە و، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستییەکی گەلێ بەرز و بەنرخە. ئەم پلەیەشم بە شێوەیەکی تایبەتی و بۆ چارەسەرکردنی دەردە قووڵ و جۆراوجۆرەکانی خۆم و، لە شێوەی داوەرییەکی شعووریی یەکجار گرنگ و، مامەڵەیەکی ئیمانیی تەواو زیندوو و، گفتوگۆیەکی تابلێی پەنهانی ناودڵدا، لێ دەرکەوت. هەر لەبەر ئەوەشە کە مەگەر کەسێك هەست و نەستەکانی لەگەڵ هەستەکانی مندا یەك بگرنەوە، دەنا هەستیان پێ ناکات و ناتوانێت چێژی تەواوەتییان لێ ببات.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ (آل عمران: ١٧٣)

کاتێ دنیاپەرستان منیان لە هەموو شتێك کرد، کەوتمە ناوەندی پێنج جۆری غەریبییەوە و، دووچاری پێنج جۆر لەو نەخۆشییانە بووم کە لە ئازار و ماندوویی سەردەمی پیریمەوە سەریان هەڵدابوو. هێندەش تەنگیان پێ هەڵچنی بووم و بێزاریان کردبووم کە "بێئاگایی" سەری تێکردم و نەیهێشت ئاوڕێك بەلای ڕووناکیی "پەیامەکانی نوور"دا بدەمەوە تاکو هێز و یارمەتیی لێ وەربگرم و دڵنەوایی خۆمی پێ بکەم، بەڵکو ڕاستەوخۆ ڕوانیمە "دڵ"م و، "ڕۆح"ی خۆمم تاقی کردەوە..

بینیم عیشقێکی تاباڵێی بەهێز بۆ "مانەوە" و "نەمری" و، خۆشەویستییەکی یەکجار بەتین بۆ "وجوود" و، سەودایەکی گەورەش بۆ "ژیان" بەسەر دەروونمدا زاڵە و خۆی بەسەر مندا سەپاندووە! هاودەم لەگەڵ ئەوەشدا "دەستەوسانی"یەکی بێسنوور و "هەژاری"یەکی لەئەندازەبەدەرم لە خۆمدا هەست پێ دەکرد. کەچی لە بەرامبەر هەموو ئەمانەوە دەمبینی "فەوتان" و "نەمان"ێکی سامناك و گرنگم لە ڕێدایە، کە ئەو "مانەوە" و "ژیان"ە لەناو دەبەن و هەموو ئاواتەکانیشم دەکوژێننەوە!

کە لەم حاڵەدا ئەمەم بەدی کرد، منیش وەك ئەو شاعیرە دڵ سووتاوە[1] لەبەر خۆمەوە شیعرەکەی ئەوم خوێندەوە کە دەڵێت:

"دانست" خوازیاری فەنای جەستەمە
"ئەبەد" ئاواتی دڵی خەستەمە
دەروونم کەیلی پەژارە و دەردە
لوقمان سەرسامە و تیمار ئەستەمە

ئیتر بە نائومێدییەوە سەرم داخست.. کەچی لە ناکاودا ئایەتی ﴿حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ هات بە هانامەوە و، پێی وتم:

"بە وردی بمخوێنەرەوە"..

منیش هەموو ڕۆژێك پێنج سەد جار دەمخوێندەوە.

ئنجا تەنها نۆ دانە پلەم لە نوور و پلە بەرز و بەنرخەکانی نووسی، لەوانەی کە بە "عین الیقین" لێم دەرکەوتن، سەبارەت بە درێژەپێدانی ئەو پلانەش بە "علم الیقین" - نەك "عین الیقین" - ئەوا بە پەیامەکانی نووری دەسپێرم.

❐ **یەکەم پلەی نووریی "حەسبی":**

ئەو "عیشقی مانەوە"یەی کە لە مندایە، لە ڕاستیدا ناڕوانێتە مانەوەی "من"، بەڵکو دەڕوانێتە "بوون"ی ئەو خاوەن کەماڵە ڕەهایە و، "کەماڵ" و "مانەوە"ی ئەو. چونکە یەکێك لە سێبەرەکانی یەك درەوشانەوەی ناوێکی خوای گەورەی

---

(١) مەبەست لەو شاعیرە "نیازیی میسری"یە (١٦١٨-١٦٩٤ز). زانا و شاعیرێکی خەڵکی گوندێکی سەر بە پارێزگەی "مەلاتیە"ی باکووری کوردستانە. خوێندنی لە "ئەزهەر" تەواو کردووە، هەر لەبەر ئەوەش پێی وتراوە "میسری". کاتێ لە میسر گەڕاوەتەوە دەستی کردووە بە ڕێنمایی موسڵمانان لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئەو کاتەی ئەستەمبووڵدا. جگە لە "دیوانی شیعر" و "مەکتووبات"ەکەی، چەند بەرهەمێکی تری هەیە وەك: "موائد العرفان"؛ "عوائد الإحسان"؛ "هداية الإخوان". (وەرگێڕ)

خاوەن کەماڵی ڕەها و جوانیی ڕاستەقینە - کە خۆی لە خۆیدا خۆشەویستە - لە چییەتی(ماهیة)ی مندا هەیە. جا ئەو عیشقی "مانەوە"یەی کە لە مندایە و دەڕوانێتە "بوون" و "مانەوە"ی ئەو خاوەن کەماڵە ڕەهایە، بەهۆی بێئاگاییەوە، ڕێگای ون کرد و سەری لێ شێوا و دەستی بە سێبەرەکەوە گرت و، عیشقی مانەوەی ئاوێنەکەی کەوتە سەر!

بەڵام هەر کە ئایەتی ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ هات و پەردەی لە ڕووی ئەم ڕاستییە لادا، هەستم کرد، بەڵکو بە "حق اليقين" چەشتم و بینیم کە:

خودی لەزەتی مانەوە و بەختیاریم، تەنانەت لەزەتی لەوە باشتریشم لەوەدایە کە بە دڵنیایی و ملکەچییەوە باوەڕ بە "مانەوە"ی ئەو خواوەندە باقی و خاوەن کەماڵە بهێنم و، ئیمانم ببێت بەوەی کە هەر تەنها ئەو خوا و پەروەردگارمە.

بێگومان بە "مانەوە"ی "ئەو"، ڕاستییەکی نەبڕاوەی نەمر و زیندوو بۆ "من" دێتەدی. چونکە بە هەستێکی ئیمانی دەچەسپێت کە (ماهییەتی من دەبێت بە سێبەرێك بۆ ناوێکی باقی و سەرمەدی، کەواتە ئیتر ئەو ماهییەتەم نامرێت).

هەروەها بەو هەست و شعوورە ئیمانییەی کە مرۆڤ دەگەیەنێتە "بوون"ی کەماڵی ڕەها و خۆشەویستی ڕەها، خۆشەویستییە زاتی و سروشتییە توندوتیژەکەش تێر دەبێت..

هەروەها بەو هەست و شعوورە ئیمانییەی کە تایبەتە بە مانەوە و بوونی "باقیی هەمیشەیی"، هەموو کەماڵ و تایبەتکارییەکی بوونەوەران بە تایبەتی ڕەگەزی مرۆڤ دەزانرێن و دەردەکەون. هەروەك دەزانرێت کە شەیدایی ناو ناخی سروشتی مرۆڤ بۆ "کەماڵ" لە زۆر ئازاری بێسنوور ڕزگاری دەکات. ئیتر مرۆڤ چێژ و لەزەتی ئەم دەرەنجامە بۆ خۆی دەچێژێت..

هەروەها ئەو هەست و شعوورە ئیمانییە پەیوەندییەك بۆ مرۆڤ بەو خواوەندە باقی و هەمیشەییەوە دەبەستێت و، لە ڕێی باوەڕبوونیشیەوە بەو

نیسبەت و پەیوەندییە گەلێ جۆری پەیوەست و پەیوەندیی لەگەڵ سەرانسەری مولڵکی ئەو باقییەدا بۆ گرێ دەدرێت. ئیتر مرۆڤ بە "نووری ئیمان" دەڕوانێتە مولڵکێکی بێسنوور بە وێنەی ئەوەی کە بۆ مولڵکی خۆی بڕوانێت و، بەم پێیە لە ناوەڕۆك و واتادا سوودێکی لەم جۆرەی دەست دەکەوێت..

هەروەها بەو هەست و شعووره ئیمانی و نیسبەت و پەیوەندییە، جۆرە پەیوەستییەك لەگەڵ هەموو بوونەوەراندا بۆ مرۆڤ پێکدێت. دیارە لەم حاڵەتەدا جگە لە "بوونی کەسیی خۆی" کە دەکەوێتە پلەی دووهەمەوە، لە ڕووی ئەو هەستە ئیمانی و پەیوەندی و هاوئاهەنگییەوە، بوونێکی بێسنووریش سەر هەڵدەدات. بە ڕادەیەك کە دەڵێیت ئەو "وجوود"ە بە وێنەی وجوودی خۆی وایە! ئیتر لەم ڕێیەوە کەفوکوڵی عیشق و خۆشەویستیی سروشتیی مرۆڤ بەرامبەر "وجوود" هێمن و هێور دەبێتەوە..

هەروەها بەو هەست و شعووره ئیمانی و نیسبەت و پەیوەندییە، "برایەتی" بۆ مرۆڤ لەگەڵ هەموو ئەهلی فەزڵ و کەماڵدا پەیدا دەبێت. دیارە لەو کاتەدا بە فەزڵی ناسینی بوون و مانەوەی خواوەندی باقی و هەمیشەیی، ئەو برا لەژمارەبەدەرانەی ئەهلی فەزڵ و کەماڵ بە زایە ناچن و لەناونابرێن. بەڵکو هەموویان "مانەوە" بەدەست دەهێنن. ئیتر مانەوە و بەردەوامیی کەماڵی ئەو خۆشەویستە لەژمارەبەدەرانەی کە پەیوەندیی خۆشەویستی و ڕێز و سەرسووڕمانی لەگەڵدا بەستوون، چێژێکی یەکجار بەرز و بڵند بۆ ئەو خاوەن هەست و شعووره ئیمانییە بەرهەم دەهێنێت..

هەروەها بەهۆی ئەو هەست و شعووره ئیمانی و نیسبەت و پەیوەندی و برایەتییەوە، بینیم کە:

دەتوانم هەست بە بەختەوەرییەکی بێسنوور بکەم کە لە بەختەوەریی هەموو خۆشەویستانمەوە سەرچاوەی گرتووە، لەوانەی کە بە هەموو ڕەزامەندی و خۆشحاڵییەکی خۆمەوە ئامادەم ژیان و مانەوەی خۆم لە پێناوی بەختەوەریی

ئەوانـدا بەخـت بـکەم! چـونکە هـاوڕێی دڵسـۆز و میهرەبـان بە بەختەوەریـی هاوڕێ خۆشەویستەکەی بەختەوەر دەبێت و چێژ و لەزەتی لێ دەبات.

لەبەر ئەوە، بە "مانەوە" و "بوون"ی خـوای بـاقیی خـاوەن کەمـاڵ، هەمـوو سەروەر و خۆشەویستانم لە پێغەمبەران - دروودیان لەسـەر بێـت - و ئەولیـا و ئەصـفیا، لە پێشـەنگیانەوە پێغەمـبەری سـەروەر ﷺ و ئـالی بەیـت و هـاوەڵە بەڕێزەکانی و، سەرجەمی خۆشەویستە لەژمارەبەدەرەکانی تریشـم، لە ئیعـدامی هەمیشەیی ڕزگاریان دەبێت و بەختەوەرییەکی هەتاهەتایی بەدەست دەهێنن.

ئەمەشـم بەو شـعووورە ئیمانیـیە هەسـت پـێ کـرد و، تیشـکی بەشـێك لە بەختەوەرییەکانی ئەوانم بەسەردا شکایەوە و، بە چەشـنێکی خـاوێن و بـێگەرد چێـژ و لەزەتـم لـێ بـرد. ئیـتر بەهـۆی ئەو پەیوەنـدی و، بـرایەتی و، خۆشەویسـتییەوە، بەختەوەریـیەکی یەکجـار گەورە منـی لە ئـامێز گـرت و حەواندمیەوە..

هەروەها بەهۆی ڕزگاربوونمەوە لە چەندین ئازاری بێسنووری پەیوەندیم بە هاوڕەگەزەکـانمەوە و سـۆز و شـەفەقەتم بـۆ خـزم و کەسـانم، هەسـتم بە بەختەوەرییەکی ڕۆحیـی نەبـڕاوە و بـێ کۆتـایی دەکـرد. چـونکە بە هەسـت و شعوورێکی ئـیمانی هەسـتم کـرد کە سـەرجەمی خزمەکـانم لە ڕووی وەچە و نەسـەب و نـاوەرۆکەوە و هەمـوو ئەوانەی کە مـن بە فەخـر و شـانازییەکی سروشتییەوە ژیان و مانەوەی خۆم لە پێنـاوی ڕزگاربوونیانـدا لە گیروگرفـت و مەترسییەکان بەخت دەکەم، لە پێشەکیی هەموویانەوە باوکان و دایکانم..

هەستم کرد کە هەموو ئەوانە، بەهۆی "مانەوە" و "بوون"ی خواوەندی باقیی ڕاستەقینەوە، لە فەنا و نەمان و ئیعدامی هەتاهەتایی و چەندین ئازاری بێسنوور ڕزگاریان دەبێت و، میهرەبانییەکی فراوان و ڕەهایان دەسـت دەکەوێـت و، هەر ئەو میهرەبانییە فراوان و ڕەهایەش لە بریی شـەفەقەتە جـوزئی و کـورت و بـێ کـاریگەری و خەمـدەر و ئازاربەخشـەکەی مـن، چـاودێری و پارێزگارییـان

دەکـات. هەروەك دایـکی بەشـەفەقەت لەزەت و چێـژ لە حەوانەوە و لەزەت و چێـژی منـاڵەکەی دەبـات، منـیش بە هەمـان جـۆر چێـژ و بەخـتەوەریم لە ڕزگاربوونی هەموو ئەوانەوە چەشت کە شەفەقەت و بەزەییم بۆیـان هەیە، لەو ڕووەوە کە ڕۆشـتوونەتە ژێـر سـایە و چـاودێریی ئەو نـیعمەت و میهرەبـانییە فراوانەوە، ئەم هەست پێکردنەش گەلـێ دڵخـۆش و شـادمانی کـردم. بـۆیە لە ناخەوە گەلێ شوکر و سوپاسم پێشکەشی خوای گەورە کرد..

هەروەها بەو هەست و شعوورە ئیمانییە ڕزگاربوونی "پەیامەکـانی نـوور"م بینی - کە بەری ژیانم و مایەی بەختەوەریم و ئەرکی سروشتیی سەرشانمن - لە زایەبوون و تیاچوون و پووکانەوە و بـێکەڵکی. هەر بەو پەیوەنـدییە ئیمانیـیەش زانیم و تەنانەت هەستیشم کرد کە ئەو پەیامانە بە تەڕ و پـاراوی دەمێنـنەوە و بە جـۆرێکی مەعـنەوی گەشـە دەکەن. تەنـانەت هەسـتم کـرد کە بە بەردەوامـی دەمێننەوە و گەلێ بەروبوومی پێگەیشتووی بەتام و لەزەتیش بەرهەم دەهێنن..

ئیتر قەناعەتی تەواوم کرد کە چێـژێکی مەعنەویـی گەلـێ زیـاتر لە چێـژ و لەزەتی "مانەوەی خـۆم" لەمەدا هەیە و، بە هەسـتێکی ڕاسـتەقینەش هەسـتێکی تەواوم بەو چێژ و لەزەتە کرد. چونکە ئیمانم هێنا بەوەی کە بەهـۆی "بـوون" و "مانەوە"ی خواوەندی بـاقی و خـاوەن کەمـاڵەوە نەك هەر تەنهـا لەسـەر دڵ و بیـری خەڵکیـدا "پەیامەکـانی نـوور" نەخـش دەبـن، بەڵکـو جـگە لەوەش ئەم پەیامانە دەبن بە مایە و جێی موتاڵاکردن و خوێنـدنەوەی بـوونەوەرانی خـاوەن هەست و شعوور و ڕۆحانیانی لەژمارەبەدەر و بێسنوور!

ئەمە جگە لەوەی کە - ئەگەر خوای گەورە لێیان ڕازی بێـت - ئەوا وێنەیـان لەناو "لەوحی مەحفووز" و سـەرجەم تـابلۆ پارێزراوەکانـدا دەردەکەوێـت و بە چەندین بەروبوومی خێر و پاداشت دەڕازێنەوە. بە تایبەت بـوونی ئەو پەیامـانە لە ماوەی تەنها یەك ئان و کاتدا کە - پشت بە خوا - تیایدا بەهرەمەندی ڕوانینی پەروەردگـار بـبن لە ڕووی پەیوەنـدییان بە قورئـانی پیـرۆزەوە و بەدەستهێنانی

ڕەزامەندیی خواوەند و قبووڵ کردنیـان لە لایەن پێغەمـبەرەوە ﷺ، ئەمە گەلـێ گەورە و مەزنـترە لە ڕێزلێنـان و تەقـدیری سەرانسـەری هەمـوو خەڵـکی دنیـا بەگشتی.. هەروەها زانیم کە بەختەوەریی من لە خزمەتکردنی ئەو پەیامـانەدایە بۆ قورئانی پیـرۆز. بـۆیە مـن هەمـوو کاتێـك ئامـادەم کە لە پێنـاوی مـانەوە و بەردەوامیی هەموو یەکێکی ئەو پەیامانەی کە ڕاستییەکانی ئیمان دەچەسـپێنن و پشتیان دەگرن، هەروەها بۆ سوودگەیاندنیان بە خەڵکی و قبـووڵ بوونیـان لای خوای گەورە، ژیان و مانەوەی خۆم بەخت بکەم. ئیتر بەو پەیوەنـدییە ئیمانیـیە تێگەیشـتم لەوەی کە ئەو پەیامـانە بەهـۆی "مـانەوە"ی خـوای گەورەوە ڕێـز و تەقدیرێکیان دەست دەکەوێت کە سەد هێندەی ڕێز و تەقدیری خەڵـکی زیـاتر بێت. بۆیە بە هەموو توانا و هێزێکی خۆمەوە وتم:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾.

هەروەها بەو هەست و شعووره ئیمانییە زانیم و تێگەیشتم لەوەی کە:

ئیمان و باوەڕم بە "بوون" و "مانەوە"ی خوای باقیی شکۆمەند، مانەوەیەکی ئەبەدی و ژیانێکی بەردەوامم پێ دەبەخشـێت و، بەروبوومەکـانی ئیمانـیش کە بریتین لە "کردەوە چاکەکان" بەروبوومی باقی و نەبـڕاوەی ئەم ژیـانە فـانییەن و چەند هۆکارێکن بۆ مانەوەیەکی بەردەوام. ئیتر قەناعەتم بە دەروونی خۆم کـرد کە مـن وەك ئەو تـۆوە وابـم واز لە تـوێکڵەکەی دەهێنێـت بـۆ ئەوەی ببێـت بە درەختـێکی گەورەی بەردار. واتە قەنـاعەتم پـێ کـرد کە دەسـت لە "مـانەوەی دنیا"م هەڵبگرێت، کە وەکو توێکڵ وایە، بۆ ئەوەی بەروبوومی "باقی" و نەبڕاوە ببەخشێت. ئیتر پێکەوە لەگەڵ دەروونی خۆمدا وتمان:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾!

بەڵێ، مانەوەی ئەو خواوەندە سەروزیادی ئێمەیە!

هەروەها بەو هەست و شعووره ئیمانی و پەیوەندیی بەنـدایەتییە، تـا پـلەی "علم اليقين" زانیم کە لە پشت پەردەی گڵی گۆڕەوە جیهانێکی ڕووناك هەیە و،

ڕۆژێك دێت کە ئەو چینە گـڵە چڕەی مردووانیـان لە ژێـردایە لا دەبرێـت و، زانیشم کە ئەو تونێلەی مـرۆڤ لە دەرگـای گـۆڕەوە دەڕواتە نـاوی هەرگیـز بە "تاریکستانی عەدەم" کۆتایی پێ نایەت. بۆیە لە ناخەوە وتم:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾.

هەروەها بەو هەست و شعوورە ئیمانییە هەسـتێکی تەواوم کـرد و بە "حـق الیقین"یش زانیم کە:

لەو کاتەدا عیشقی گەرموگوڕ و لەڕادەبەدەری ناو سروشتم بۆ "مـانەوە"، لە دوو لایەنەوە ڕووی لە "بوون" و "مانەوە"ی خواوەندی باقیی خـاوەن کەمـاڵە، کەچی بەهۆی ئەو پەردانەی کە لە لایەن "خۆویستی"ی مرۆڤەوە دادراونەتەوە، ڕێی گەیشتنی بە خۆشەویستەکەی هەڵە کرد و دەستی لە داوێنی ئـاوێنەکە گیـر کرد و شەیدای بوو! بۆیە سەرسام ما و لە ڕێ ترازا. چونکە زاڵبـوونی سـێبەری نـــاوێکی ئەو خـــاوەن کـــەماڵە ڕەهـــایەی (کە خـــۆی لە خۆیـــدا مـــایەی خۆشەویستییە و فیترەتی مرۆڤ خـۆشی دەوێـت و پەرسـتراوی خۆشەویسـتە) بەسەر ماهییەتمدا، ئەم "عیشقی مانەوە" قـووڵ و بەهێـز و دامەزراوەی لە منـدا جێگیر کردووە..

جـا لە کاتێکـدا کەمـاڵی زاتیـی ئەو پەرسـتراوە سـەروزیادی پەرسـتن و خۆشویسـتنە، چـونکە جـگە لە زاتی خـۆی هـیچ شـتێك نیـیە داخـوازی خۆشەویستی بێت و هیچ هۆکار و ئامانجێکیش نییە هانـدەری خۆشەویسـتیی جـگە لەو بێـت، کەچـی بە بەخشـینی ئەو چەشـنە نـیعمەت و بەروبـوومە نەبڕاوانەی باس کران (کە هەر یەکەیـان شـایانی ئەوەن نەك تەنهـا یەك ژیـان و مانەوە بەڵکو هەزاران ژیان و مانەوەیان لە پێناودا بەخت بکرێت) بە بەخشـینی ئەمـــانە، هەســـتم کـــرد کە ئەو کەمـــاڵە زاتیـــیەی پەرســـتراوی ئەزەلی بەم چاکەکاریيانەی خۆی پتر ئەو عیشـقە سروشـتییەی لە منـدا قـووڵ و دامەزراو کردووە. خۆ ئەگەر لە توانامدا بوایە ئەوا بە هەموو گەردیلەکـانی وجـوودم (لە

خۆشیدا) دەموت: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾! تەنانەت بە نیەت و نیاز وتیشم!

ئەو هەستە ئیمانییەی کە بە شوێن "مانەوە"ی خۆیدا دەگەڕێت و لە ئەنجامدا مانەوەی خوای گەورەی دۆزییەوە - وەك بەو بڕگانەی پێشوو کە بە "هەروەها.. هەروەها" دەست پێ دەکەن ئاماژەم بۆ هەندێ لە بەروبوومەکانی کرد - چێژ و شەوقێکی ئەوتۆی پێ بەخشیم کە سەرجەمی قەوارە و سەرانسەری ڕۆحی منیان گرتەوە. بۆیە بە هەموو هێزێکی خۆم و لە ناخی دڵمەوە و هاودەم لەگەڵ دەروونی خۆمدا وتم:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾!

❑ دووهەم پلەی نووریی "حەسبی":

لەگەڵ ئەو بێدەستەڵاتی و کۆڵەوارییەی کە لە سروشتمدایە و، ئەو پیرییەی کە سەری تێکردبووم و، ئەو غەریبییەی کەوتبوومە ناویەوە و، ئەو بێکەسی و تەنیا باڵییەشدا کە تیایدا بووم و لە هەموو شتێك دابڕ کرابووم، دنیاپەرستان - بە پلانی خۆیان و لە ڕێی سیخوڕەکانیانەوە - هێرشێکی بێ بەزەییانەیان کردبووە سەرم.. ئا لەم کاتەدا، ڕووم لە دڵم کرد و پێم وت:

"چەندین سوپای چڕوپڕ و زۆر و زەبەندە هێرش دەکەنە سەر تاقە کەسێکی لاوازی نەخۆشی دەست بەستراو! ئایا من هیچ پشت و پەنایەکم نییە"؟

گەڕامەوە بۆ ئایەتی:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾.

ئەویش پێی ڕاگەیاندم کە:

لەبەر ئەوەی تۆ (ناسنامەی پەیوەندیی ئیمان)یت هەیە، ئەوا بە هۆی ئەم پەیوەندییەوە سەر بە پادشایەکی هێندە گەورە و خاوەن دەستەڵاتی ڕەهایت، کە لە وەرزی بەهاردا، بەوپەڕی ڕێکوپێکی، پێداویستیی سەرجەم سوپاکانی ڕووەك و زیندەوەران - کە لە چوارسەد هەزار ڕەگەزی جۆراوجۆرن و لە

سەرانسەری زەویدا پەرش و بڵاون - دابین دەکات و.. بەرگ و پۆشاکی هەردوو سوپا مەزنەکەی خۆی - کە درەخت و باڵندەکانن - بە پۆشاکی تازە و جوان نوێ دەکاتەوە و مەدالیاکانیان دەگۆڕێت بە هی نوێ، تەنانەت بە وێنەی گۆڕینی بەرگ و پۆشاکی جوان و ڕەنگینی پەلەوەرەکان، پۆشاکی چیا و دەشت و دەرەکانیش دەگۆڕێت و تازەیان دەکاتەوە و.. ڕۆزیی سوپای هەموو گیانلەبەران دابەش دەکات کە مرۆڤ لە پێشەکیی هەموویانەوەیە. ئەمەش نەك بە وێنەی ئەو ڕۆزییانەی کە ئێستا مرۆڤ لە شێوەی پوختەکراوەکانی شەکر و گۆشت و شتی تردا ڕێیان پێ بردووە، بەڵکو لە شێوەی چەندین پوختەکراوی سەد جار لەوانە تەواوتر و باشتردا. ئەو ڕۆزییانە، کاکڵە و پوختەکراوی هەموو جۆرە خۆراکێکن. تەنانەت ئەو شتانەی کە پێیان دەوترێت "ناوك" و "تۆو" لە ڕاستیدا پوختەکراوە خواییەکانن. زیاد لەمەش، ئەو پوختەکراوانە بە چەند بەرگێکی تایبەتی "قەدەر" کە لەگەڵ پێگەیشتن و نەشونمایاندا بگونجێ، دەپێچێتەوە و، لە چەندین قوتو و سندووقی بچووکدا دەیانپارێزێت. ئەم سندووقانەش لە کارگەی "ك. ن" و بە فەرمانی "كُنْ" زۆر بە خێرایی و بە ئاسانییەکی ڕەها و زۆرییەکی لەڕادەبەدەر دروست دەکرێن، بە ڕادەیەك کە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ:

﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (البقرة:١١٧).

خۆ هەرچەندە ئەو پوختە خۆراکانە لە یەك دەچن و لە هەمان ماددەی یەکتر پێکهاتوون و لەوانەشە بەشی پێویستیی یەك شاریش نەکەن، کەچی ڕۆزیدەری بەخشندە لە تەنها یەك وەرزی هاویندا هێندە خواردنی جۆراوجۆر و بەلەزەتیان لێ پێ دەگەیەنێت کە بگونجێت هەموو شارەکانی سەرزەوییان لێ پڕ بکرێت.

جا مادەم بەهۆی "پێناسی پەیوەندیی ئیمان"ەوە پشتیوانێکی وەك ئەمەت دەست کەوتووە، ئەوا دەتوانیت بە دڵنیاییەوە پاڵ بە هێز و دەستەڵاتێکی گەورە و ڕەهاوە بدەیت و پشتی پێ ببەستیت.

لە ڕاستیشدا هەر کاتێك ئەم وانەیەم لەم ئایەتە پیرۆزە وەردەگرت، هەستم بە هێز و توانایەکی گەورەی مەعنەوی دەکرد و، لە خۆمدا هێزێکی وام شك دەبرد کە بتوانم نەك هەر ئەوانەی دەوروبەر و نزیکی خۆم، بەڵکو بەرەنگاری هەموو دوژمنێکی لە جیهاندا پێ بکەم! هەر ئەمەش بوو کە هانی دام لە قووڵایی و ناخی ڕۆحمەوە ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ بخوێنمەوە و دووپاتی بکەمەوە.

جارێکی تر لە ڕووی هەژاری و موحتاجیی نەبڕاوە و بێکۆتایی خۆمەوە و بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی خاڵێکی یارمەتی لێ وەرگرتن بۆ ئەم دووانە، سەرم لە هەمان ئایەتی پیرۆز دایەوە. ئەویش پێی فەرمووم:

تۆ لە ڕێی "بەندایەتی" و "موڵکایەتی"تەوە پەیوەندیت بە خاوەن موڵکێکی بەخشندەوە هەیە و، ناویشت لە دەفتەری ژیاندنی بوونەوەراندا تۆمار کراوە. ئنجا لە هەموو بەهار و هاوینێکدا ئەو خاوەن موڵکە بەخشندەیە سەد جار زیاتر سفرەی نیعمەتەکانی ڕادەخات و هەڵیاندەگرێتەوە و، بە چەندین خواردەمەنیی جۆراوجۆر و بەتام و لەزەت دەیانڕازێنێتەوە کە لە جیهانی غەیب و جیهانی عەدەم و گڵێکی بێ گیان و، بە چەشنێ کە هەر لە حسابی بەندەکەیدا نەبووە، لەسەر ئەو سفرەیە ئامادەیان دەکات. تەنانەت دەڵێی ساڵەکانی زەمان و ڕۆژەکانی ساڵ چەند قاپ و دەفرێکی یەك لە دوای یەکن بۆ بەروبوومەکانی چاکەی خواوەند و خۆراکی میهرەبانییەکەی و، چەند پیشانگایەکن بۆ پیشاندانی نیعمەتەکانی ڕۆزیدەری میهرەبان لە چەند پلەیەکی کوللی و جوزئیدا. جا تۆش بەندەی دەوڵەمەندێکی ئاوا ڕەهایت. کەواتە گەر هەست بەم بەندایەتییەی خۆت بۆ ئەو میهرەبانە دەکەیت، ئەوا هەژارییە ئازاربەخشەکەت دەبێت بە مایەی ئیشتیهایەکی خۆش و بەلەزەت.

منیش لە لایەنی خۆمەوە بەشی خۆمم لەم واتایەی ئەم ئایەتە پیرۆزە وەرگرت و، هاودەم لەگەڵ دەروونی خۆمدا وتم:

بەڵێ.. بەڵێ، ئەمە تەواو ڕاستە..

ئنجا پشتم بە خوای گەورە بەست و، وتم:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾.

❐ سێهەم پلەی نووریی "حەسبی":

کاتێ پاڵەپەستۆی نەخۆشی و هەموو شێوەکانی نامۆیی و جۆرەکانی ستەم لە سەرم توند بوون، هەستم کرد بەوەی کە سەرجەم پەیوەندییەکانم لەگەڵ دنیادا دەپچڕێن و، "ئیمان"یش لەلای خۆیەوە ڕێنمایی دەکردم و، پێی دەوتم: (تۆ بۆ دنیایەکی تری ئەبەدی دەستنیشان کراویت و، شایستەی وڵاتێکی هەتاهەتایی و بەختیارییەکی هەمیشەییت).

لەم کاتەدا هەر شتێك حەسرەتی لێ بچۆڕایە و بیخستمایەتە داخ و خەفەتەوە، وازم لێ هێنان و دەستم لێ داتەکاندن و، گۆڕیمن بەو شتانەی کە مزگێنیی خێر و خۆشییان تێدایە و بەردەوام دەمخەنە شوکر و سوپاسی خوای گەورەوە.

بەڵام ئایا ئەم ئامانجە چۆن هەتاسەر دێتەدی کە ئەوپەڕی ئاوات و ئامانجی ئەندێشە و مەبەستی ڕۆح و ئاکامی سروشتی مرۆڤە، ئەگەر ئەو خواوەندە بەدەستەڵاتە نەیهێنێتەدی کە خاوەنی توانستی ڕەهایە؟ ئەو خوایەی کە ئاگای لە هەموو جموجووڵ و وەستان و کردار و گوفتاری بەدیهاتووانیەتی و تۆماری دەکات لەسەریان؟ ئەم ئامانجە چۆن دێتەدی ئەگەر چاودێریی بێسنووری ئەو خوایە نەبێت بۆ ئەم مرۆڤە بچووکەی کە لەناو بێ دەستەڵاتیی ڕەهادا دەتلێتەوە و، خوا هێندە ڕێزی لێ گرتووە کە گوفتاری خۆی ئاراستە کردووە و، لە نێوان هەموو بەدیهاتووانیدا پلەی بەرزی بەو بەخشیوە؟

بەڵێ، کاتێ کە بیرم لەم دوو خاڵە دەکردەوە، واتە لە کارایی و لێهاتوویی ئەم دەستەڵاتە بێسنوورە و، ئەو گرنگییە ڕاستەقینەیەش کە خوای باڵادەست بەم مرۆڤەی داوە کە لە ڕواڵەتدا کەم نرخ دیارە.. کاتێ بیرم لەم دوو خاڵە

دەکردەوە، دەمویست لە ڕووی ئیمانەوە ئەم دوو خاڵەم بە چەشـنێك بـۆ ڕوون ببێتەوە کە بە تەواوی دڵنیاییم پێ ببەخشێت.

بۆ ئەم مەبەستە سەرم لە هەمان ئایەتی پیرۆزی ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيـل﴾ دایەوە.

ئەویش پێی وتم:

(سەرنج لەو "نا"یە بدە کە لە "حسبنا"دایە و، بزانە ئەوانە کێن کە چ بە زمانی حاڵ و چ بە زمانی گوفتار لەگەڵ تۆدا دەڵێن: "حسبنا" و، بۆ خۆت گوێیان لـێ ڕابگرە).

بەڵێ، ئەم ئایەتە بەم جۆرە فەرمانی پێ دام..

منـیش کە سـەیرم کـرد و سـەرنجم دا، چەنـدین جـۆری لە ژمـارەبەدەری باڵندەی گەورە و مێرووی باڵداری یەکجـار بچـووکی وەك مـێش و، چەنـدەها جۆر زیندەوەری گەورە و بچووك و ڕووەك و درەختی لەژمارەبەدەری گەورە و بچووك و بێکۆتـاییم بینـی کە هەموویـان بە زمـانی حـاڵ لەگەڵ منـدا واتـای ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾یان دەوتەوە و یادی غەیری خۆیشیان دەخستەوە!

هەروەهـا بینـیم ئەم بـوونەوەرانە باشـترین بریکاریـان هەیە کە دابینکـردنی هەموو مەرجەکانی ژیانی ئەوانی گرتووەتە ئەستۆ. تەنـانەت لەو هێلکـانەی کە لەیەك دەچن و لە هەمان ماددەی یەکتر پێکهاتوون، هەروەها لەو "مەنی"یـانەی کە وەك یەك وان و، لەو نـاوك و تۆوانەی شـێوەیـان لە یەکـتر دەچێـت، بەبـێ هەڵە و ناتەواوی و لێتێکچوون و زۆر بە ڕێکوپێکی و جـوانی و هاوسـەنگی و ڕازاوەیی، سەد هەزار جۆر زیندەوەر و سەد هەزار شێوە پەلەوەر و سـەد هەزار جـۆر ڕووەك و سـەد هەزار جـۆر درەخـت بەدی دەهێنێـت و لێکیـان جیـا دەکاتەوە. ئەم بەدیهێنانەش بە بەردەوامی و بەوپەڕی زۆری و ئاسانی و فراوانی لە کاردایە، بە تایبەت لە وەرزی بەهاردا کە بەچاوی خۆمان دەیبینین.

جـا بەدیهێنـانی ئەم شـتانە بە کـۆمەڵی و بە چەشـنێکی لەیەکچـووی تێهەڵکـێش و، لەسـەر هەمـان شـێوە و، لە ناوەنـدی مەزنـایەتیی ئەم توانستە ڕەهایەدا، بە ڕوونی "تاك و تەنیایی" خوامان بۆ دەردەخات.

ئەم ئایەتە پیرۆزە تێیگەیاندم کە:

هەرگیزاو هەرگیز کەس ناتوانێت خۆی هەڵبقورتێنێت و دەست بخـاتە نـاو کاروبـاری ئەم پەروەردگـارێتی و بەدیهێنەرێتیـیەی کە ئەم مـوعجیزە لە سنووربەدەرانە پێش چاو دەخات.

پاشـان سـەیری "أنا"ی ناو "نا"ی "حسـبنا"م کـرد، واتە بـۆ خـودی خـۆمم ڕوانی و سەرنجی تێڕامانم ئاراستەی خۆم کرد. بینیم:

ئەو کەسـەی زیندەوەرانی لە دڵۆپێك ئاو دروست کردووە، منیشی هەر لەو ئاوە بەدی هێناوە و، کردوومی بە یەکێك لە موعجیزاتی خۆی، ئنجـا بیسـتن و بینینی پێ بەخشیوم و، مێشکی لەناو سەر و، دڵی لەناو سنگ و، زمـانی لەنـاو دەمدا بە شێوەیەك بۆ داناوم کە سەدان پێوەر و تەرازووی ورد و نەرمی ئەوتـۆی لەو مێشـك و دڵ و زمـانەدا بڵاوکـردووەتەوە کە دەتـوانن هەمـوو دیـاری و بەخششەکانی خواوەندی میهرەبـان بناسـن و کێشـانەیان بـکەن لەوانەی کە لە گەنجینەکانی میهرەبانیی خوای گەورەدا پاشەکەوت کراون. هەروەهـا هەزاران ئامراز و ئامێری ئەوتۆشی لەو ئەندامانەدا داناوە کە دەتوانن گەنجینە نەبـڕاوە و بێکۆتاییەکانی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەنـد بـکەنەوە و، بە ژمـارەی بۆن و تام و ڕەنگەکـانیش ناسـێنەری یارمەتیـدەر و دیـاریکراوی بەو ئـامراز و ئامێرانە بەخشیوە.

هەروەها خوای گەورە، بە کەمـاڵی ڕێکـوپێکی، گەلـێ هەسـت و نەسـتی هەستیار و پەنهان و.. بەوپەڕی ڕێکی و وردیش چەندین لایەنی ناسك و نیانی مەعنەویی لە مندا داناوە. جگە لەوەی کە بە کەماڵی دانـایی خـۆی و بەوپەڕی کامڵی و ڕێکوپێکی، چەندین ئامێری وردەکار و ئەندامی ناوازە و پێویسـتی بـۆ

ژیانی مرۆڤ لە وجوودی مندا بەدی هێناوە، تـاکو تـامی سـەرجەم جۆرەکـانی هەموو نیعمەتەکانی خۆیم پێ بچێژێت و، لە ڕێی ئەو هەستەوەرانەوە هەسـت بە هەموویـــان بـــکەم و، درەوشـــانەوەی نـــاوە جوانەکـــانی و مەزهەرە جۆراوجۆرەکـانی ئەو درەوشـانەوانەم بەو هەسـت و نەسـتە ورد و ناسـکانە تێبگەیەنێت و، پێم بناسێنێت و، بۆ چەشتن و لەزەت لێبردنیان هانم بدات.

هەروەها جگە لەوەی کە "وجوود"ی منی - کە بێـنرخ و هەژار دیـارە - وەك وجوودی هەموو ئیماندارێك خستووەتە دۆخی باشترین و جـوانترین شـێوەی گــەردوون و.. کـردوویەتی بە نوســخەیەکی بچووککــراوەی جیهــانی هەرە گەورە و.. نمــوونەی بچــووکی ئەم دنیــایە و.. مــوعجیزەیەکی ڕەنگینــی بەدیهـاتووانی و.. کرێـارێکی داواکـاری گشـت جـۆرە لەژمارەنەهاتووەکـانی نیعمەتەکانی و.. مەڵبەندێك بۆ یاسـاکانی پەروەردگـارێتییەکەی و.. هۆکارێـك بۆ جێبەجێکردنی کاروبار و فەرمانەکانی و.. نموونەیەك بۆ باخچەی گـوڵزاری بەخششەکانی دانایی و میهرەبانییەکەی و.. قسەبۆکراوی تێگەیشتوو لە گوفتارە خاوێنەکەی..

جگە لە هەموو ئەمانە، هەر ئەو خواوەندە "ژیان"یشی پێ بەخشـیوم، تـاکو نـیعمەتی هەرە مەزنی "وجـوود" لەنـاو وجـوودی منـدا گەورە و زۆر بکـات، چونکە ئەم نیعمەتی وجوودەم دەتوانێت بەهۆی ژیانەوە هێندەی جیهانی بینراو فراوانی بەدەست بهێنێت..

هەروەها نیعمەتی "مرۆڤێتی"یشی بە من بەخشیوە، ئیتر نـیعمەتی "وجـوود" بەهــۆی بەخشــین و دەرکەوتنــی ئەم مــرۆڤێتییە و لە ڕێــی هەســت و نەسـتە تایبەتییەکانی مرۆڤەوە ڕێگایەکی بۆ سوودوەرگرتن لەو سفرە و خـوانە فراوانـانە کردووەتەوە کە لە جیهانە ماددی و مەعنەوییەکاندا ڕاخراون..

هەروەها نیعمەتی ئایینی "ئیسلام"ی پێ بەخشیوم. ئیتر بەهۆی ئەم نیعمەتی ئیسلامەوە هێندەی پانتایی جیهانی پەنهان و بینراو نیعمەتی "وجوود"ی بۆ فراوان کردووم..

هەروەها نیعمەتی "ئیمانی تەحقیقی"ی پێ بەخشیوم، کە بەهۆی ئەو ئیمانەوە "نیعمەتی وجوود" سەرجەم نیعمەتەکانی دنیا و ئاخیرەتی لەخۆ گرت و توانای جێکردنەوەی هەموویانی لە خۆیدا بەدەست هێنا..

هەروەها لە ناوەندی ئەو ئیمانە تەحقیقییەدا "ناسین" و "خۆشویستن"ی خۆی پێ بەخشیم و، بەمەش پلەیەکی ئەوتۆی بە چاکەکاریی خۆی دامێ کە بوار بەو نیعمەتی "وجوود"ە بدات دەستی حەمد و سەنا بۆ گەلێ بازنەی یەکجار زۆر درێژ بکات و سوودیان لێ وەربگرێت، هەر لە بازنەی مومکیناتەوە تا جیهانی "وجووب" و بازنەی ناوە جوانەکان..

هەروەها بە شێوەیەکی تایبەتی فەزڵ و نیعمەتی "زانستێکی قورئانی" و "دانستێکی ئیمانی"ی بە من بەخشی. ئیتر بەم چاکەکارییەی خۆی بەرزییەکی بەسەر گەلێ بەدیهاتووی خۆیدا پێ بەخشیم.

بەم جۆرە، لە چەندین ڕووی زۆری وەك ئەوانەی پێشوو، خوای گەورە جامیعییەتێکی ئەوتۆی بە مرۆڤ داوە کە گەلێ شتی تێدا کۆ ببێتەوە و، هێندەش توانا و لێهاتنی پێ بەخشیوە کە مرۆڤ بکەن بە ئاوێنەیەکی کامڵ و تەواوەتی بۆ تیادەرکەوتنی "تەنیایی" و "صەمەدانییەت"ی خوای گەورە و، مرۆڤ بەهۆیانەوە بتوانێت کە بە پەرستش و بەندایەتییەکی هەمەکی و فراوان، "گوێڕایەڵی" بۆ پەروەردگارێتییەکی هەمەکی و خاوێن بنوێنێت.

ئنجا بە زانینێکی لەوپەڕی دڵنیایی و ئیمانێکی کامڵەوە زانیم و ئیمانم هێنا بەوەی کە:

خوای گەورە ئەمانەت و سپاردەکەی خۆی کە لای من دایناوە و دیاری و بەخششە بەڕێزەکەشی کە بە منی بەخشیوە و بریتییە لە "وجوود" و "ژیان" و

"خود"ی خۆم، لە منی دەكرێتەوە، وەك دەقی ڕاشكاوی قورئـانی پیـرۆز بـاسی كـردووە و[1]، ســەرجەم كتێـب و صـوحوفە خـاوێنەكانی خۆیشـی كە بـۆ پێغەمبەرانی ناردوون و، گشت پێغەمـبەران و ئەولیـا و ئەصـفیا لەمەدا یەكیـان گرتووە. بۆ ئەوەش ئەو سپاردە و دیاری و بەخششەی خۆی لە مـن دەكـرێتەوە تاكو لای من زایە نەبن و لای خۆی بیانپارێزێت و دوایی بیـانگێڕێتەوە بـۆم. لە بەرامـبەر ئەم لێكرینەشـەوە بەختەوەریـیەكی هەمیشـەیی و بەهەشـتێكی هەتاهەتاییم دەداتێ و، بۆ ئەمەش بەڵێنی بێگومـانی داوە و پەیـمانی ڕاسـتی لە ئەستۆ گرتووە.

هەر لەم ئایەتە پیرۆزەوە: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيل﴾ تێگەیشتم كە:

من پەروەردگارێكی مەزنی شكۆمەند و بەخشندەی ئەوتۆم هەیە كە بە ناوی "الفتّاح"ی خۆی، بەوپەڕی ئاسانی و خێرایی و وردەكاری، لە چەنـدین دڵـۆپی ئاوی لەیەكچووی دیاری كراو، هەروەهـا لە چەنـد دانە نـاوكێكی لەیەكچـوو، شێوەی سەدان هەزار جۆری ڕووەك و زیندەوەران دەكێشێت.

هەر ئەم خواوەندە گەورە و مەزنە بایەخێكی هێندە گەورەی بەم مـرۆڤە داوە كە - وەك ئێستا باسـمان كـرد - ژێرییەكـان دووچـاری سەرسـامی دەكـات! بە ڕادەیەك كە مرۆڤی كردووە بە مایە و خـولگەی كاروبارەكـانی پەروەردگـارێتییە شـكۆمەندەكەی خـۆی و، هەر ئەو خواوەنـدە بە وێـنەی ئاسـانیی بەدیهێنـانی بەهـاری ئایینـدە و بێگومـانیی هـاتنی بەهـار، حەشریـش دەهێنێـتە كـایەوە و، نیعمەتی بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەییمان پێ دەبەخشێت.

بەڵێ، هەموو ئەم دەرس و زانینانە لەم ئایەتە پیرۆزەوە فێر بووم:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيل﴾..

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّ اللهَ اشتَرَى مِنَ الْمُؤمِنينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّة﴾ (التوبة:١١١). (وەرگێڕ)

خۆ ئەگەر لە توانامدا بوایە، ئەوا بە زمانی هەموو بەدیهاتووان و بە کردەوە ئەم ئایەتە پیرۆزەم دەخوێندەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم کارەم بە کردار لە توانادا نیە، ئەوا بە "نیەت" و "تەسەوور" و "ئەندێشە" و بە زمانی هەموویان خوێندمەوە، تەنانەت حەزیش دەکەم هەتاهەتایە هەر بەردەوام بیخوێنمەوە!

❐ چوارەم پلەی نووریی "حەسبی":

ئەو تەگەرە و لەمپەرانەی هاتنە ڕێم و لەرزەیان بە "بوون"م خست، وەك پیری و غەریبی و نەخۆشی و نیشتەجێکردنی زۆرەملێ، هەموو ئەوانە پێکەوە لەو کاتەدا هێرشیان بۆ هێنام کە "بێئاگایی" سەری تێکردبووم! وەك بڵێی "بوون"ی خۆم کە زۆر بە توندی دەستم لێ گیر کردبوو، بەرەو عەدەم هەنگاو بنێت، تەنانەت "بوون"ی هەموو بوونەوەرانیش بەرەو "نەبوون" بڕوات. ڕۆشتنی هەموو ئەمانەش بەرەو "نەمان" خەم و پەژارە و نیگەرانییەکی توندوتیژیان بۆ فەراهەم هێنام..

ئا لەم کاتەدا سەرم لە ئایەتی ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ دایەوە..

ئەویش پێی وتم:

(لە واتاکانم ورد بەرەوە و، بە چاوی ئیمان بۆیان بڕوانە)!

منیش کە بە چاوی ئیمانەوە بۆم ڕوانین، بینیم:

"بوون"ی من کە - وەك بوونی هەر موسڵمانێکی تر - گەردیلەیەکی تابڵێی لاواز و بچووکە، لە ڕاستیدا ئاوێنەیەکە بۆ بوونێکی بێسنوور و، هۆکارێکە بۆ دەستکەوتنی جۆرەها بوونی زۆر و لە ژمارە نەهاتوو، کە بە چەشنێکی بێکۆتایی دەکرێنەوە و دەردەکەون. هەروەها وەکو وشەیەکی پڕ لە دانایی وایە کە چەندەها "بوون"ی هەمیشەیی دەبەخشێت کە زۆر لە خۆی گرانتر و بەرزتر و بەنرخترن. تەنانەت بە "علم الیقین" زانیم کە تاقە چرکەیەکی ئەم بوونەی من - لە ڕووی پەیوەندیی ئیمانییەوە - بە ئەندازەی بوونێکی هەمیشەیی گران و بەنرخە..

چـونکە مـادەم مـن بە هەسـتی ئـیمانی دەمـزانی کە بـوونی مـن تەنهـا درەوشـانەوە و ئاسـەوارێکی خـوای گەورەی "واجـب الوجـود"ە و یەکـێکە لە بەدیهاتووە ڕێك و جوانەکانی، ئەوا ئەم زانینە لەو تاریکییە بـێ سـنوورانەی کە زادەی چەند وەهمێکی ترسناك بوون و، لە ئـازاری دوور و درێـژی جـودایی و لێکـدابـڕانە بێکۆتاییەکـانیش ڕزگـاری کـردم. هەر ئەم زانیـنەش بە ئەنـدازەی ژمارەی کار و ناوە جوانەکانی خوای گەورە - کە پەیوەندییان بە بـوونەوەرانەوە هەیە - پەیوەنـدیی برایـانەی لە نێـوان مـن و بـوونەوەردا، بە تـایبەتی لەگەڵ زیندەوەرانـدا، بـۆ دروسـت کـردم. هەروەهـا ئەوەشـم زانی کە لە ناوەنـدی جـودایی و لێکـدابڕانێکی کـاتیی - وەك "مـردن"دا - بە یەك گەیشـتنەوە و پەیوەندییەکی هەمیشەییم دەست دەکەوێت لەگەڵ سـەرجەمی خۆشەویسـتانم لە بوونەوەردا!

ئاشکرایە کە ئەو کەسانەی پەیوەندییەکانی: یەك گوند، یـان یەك شـار، یـان یەك وڵات، یان یەك هێزی سەربازی، یان یەك سـەرکردە، یـان یەك مامۆسـتای ڕابەر، یان هەر پەیوەندییەکی وەك ئەمانە یەکیان دەخات، لەناو خۆیاندا هەست بە بـرایەتییەکی خـۆش و ناسـك و هـاوڕێیەتییەکی بەهێـز دەکەن. بەڵام ئەو کەسـانەی کە لەم چەشـنە پەیوەندیـدەرە یەکـخەرانە بـێ بەشـن، لە ئەنجـامی چەندین تاریکایی ئازاربەخشەوە هەمیشە بە سزا و ئازاری تاڵەوە دەتلێنەوە.

هەروەها ئەگەر بەروبوومەکانی درەختێك هەست و شعووریان تێدا بـوایە، ئەوا هەمـوو یەکـێکی ئەو بەروبوومـانە هەسـتی دەکـرد کە خوشـك و بـرا و خـاوەن و بریکـاری ئەوانی تـرە و بۆیـان دەڕوانێـت. بەڵام گەر "درەخـت" لە گۆڕێدا نەبێـت، یـان ئەو بەروبوومـانەی لـێ بکـرێنەوە، ئەوا هەمـوو یەکـێکی بەروبوومەکان بە ئەندازەی ژمارەی هەموویان هەست بە ئازارەکانی جـودایی و لێکدابڕان دەکەن.

بەم جۆرە، "بوون"ی مـن - وەك بـوونی هەر بـاوەڕدارێکی تـر کە ئـیمان و پەیوەندیی ئیمانیی هەبێـت - چەنـدین ڕوونـاکیی "بـوون"ی ئەوتـۆی دەسـت کەوتووە کە جودایی بوونەوەرانی نایەتە ڕێ. تەنانەت گەر ئەم "بـوون"ەی مـن بڕوات و لە دەستم دەربچێت، ئەوا مانەوەی جۆرەکانی تری "بوون" دوای مـن جێی دەگرنەوە و، وەك ئەوە وایە کە هەر خۆی بە تەواوی مابێتەوە!

زیاد لەمانەش، "وجوود"ی هەموو زیندەوەرێك، بە تایبەت گیـانلەبەران، بە وێـنەی "وشـەیەك" وایە کە دەوترێـت و دەنووسرێـت و پاشـان لەبەر چـاودا دەڕوات و نامێنێت، دوای ئەوەی کە لە بریی خۆی گەلێ وجوودی تـر بەجـێ دەهێڵێت لەوانەی کە پاش خۆی دێن و، بریتین لە واتا و حەقـیقەتی میسـالی و شێوە و ئەنجامەکان و حەقـیقەتی ئەو وشـەیە و پاداشـتەکەی، گەر وشـەیەکی خاوێن بێت.. بەڵێ، ئەمانە و جۆرە زۆرەکانی "وجـوود"ی هاوچەشـنی ئەمـانە بەجێ دەهێڵێت ئنجا لەبەر چاودا دەڕوات و ون دەبێت. ئەمەشـمان بە درێـژی لە مەکتووبی بیست و چوارەمدا چەسپاندووە.

جا "بوون"ی منیش، هەروەها وجوودی هەموو زیندەوەرێك، کتومـت وەك ئەو وشەیە وایە! چونکە هەر کاتێك ئەم بـوونە ڕواڵەتیـیە بەجـێ بهێڵێـت، ئەوا ڕۆحەکەی - ئەگەر گیانلەبەر بێت - هەروەها واتا و حەقیقەت و نموونەکەی و ئەنجامە دنیاییەکانی ماهییەتی کەسیی خـۆی، هەروەهـا بەروبوومەکـانی سـەر بەودنیای و، ناوەرۆك و شێوەکەی، لە هێزی پارێزگاری بیری خەڵـکی و تـابلۆ پارێزراوەکان و شریتی فلیمی دیـمەنە هەمیشـەییەکان و لە پێشـچاوی زانسـتی ئەزەلیـدا بەجـێ دەهێڵێـت و.. هەمـوو ئەو تەسـبیحاتە سروشـتییانەش کە ئەو وجـــوودە دەنـــوێنن و مـــانەوەی پـــێ دەبەخشـــن، هەروەهـــا گـــوێڕایەڵییە ســـروشتییەکانیشی بـــۆ خواســـت و درەوشـــانەوەکانی نـــاوە جوانەکـــان و، ئەنجامـدان و لەئەسـتۆگرتنی ئەرکی ئـاوێنەی ڕواڵەتی بـۆ ئەو نـاوانە، هەمـوو ئەوانە لە دەفتەری کردەوەکانیدا دادەنێت و تۆماریان دەکات..

ئیتر بە "علم الیقـین" تێگەیشـتم و زانـیم کە هەمـوو بوونەوەرێـك لە بریـی وجوودە ڕواڵەتییەکەی، گەلێ جۆری وجوودی مەعنەویـی وەك ئەوانەی بـاس کران و زۆر لەو وجوودە ڕواڵەتییە بەرزترن، بەجێ دەهێڵێت ئنجا کۆچ دەکات.

بەم جۆرە، مرۆڤ دەتوانێـت بەهـۆی "ئـیمان" و ئەو هەسـت و شـعوور و پەیوەنـدییەی کە لە ئیمانـدایە، ببێـت بە خـاوەنی ئەم هەمـوو جـۆرە وجـوودە مەعـنەوی و بـاقی و هەمیشـەییانە، کە گەر "ئـیمان" نەبـوایە ئەوا لەنـاو "بێمەبەستی" و "هەڕەمەکێتی"دا بەرەو عەدەم دەڕۆشت و زایە دەبوو، سەرباری مەحرووم بوونیشی لەو جۆرانەی وجوود!

مـاوەیەك خەفەتی زۆرم بـۆ نەمـان و تیـاچوونی خێـرای گوڵەکـانی بەهـار دەخوارد، تەنانەت ئازاریشم بۆ حاڵی ئەو گوڵە ناسـکانە دەچەشـت. بەڵام ئەم ڕاستییە ئیمانییەی کە لێرەدا ڕوون کرایەوە، دەری خست کە:

ئەو گوڵانە لە جیهانی مەعنەویدا بریتین لە چەند تۆو و نـاوکێکی ئەوتـۆ کە بە وێنەی درەخت و گـوڵەگەنم هەمـوو جۆرەکـانی وجـوود - جـگە لە ڕۆح - دەگرن و بەرهەمیان دەهێنن، وەك پێشتر باس کرا. کەواتە ئەو دەسکەوتانەی کە ئەو گوڵانە لە ڕووی "نووری وجوود"ەوە بەدەستیان دەهێنن، سەد هێندە زیاترن لەو وجـوودەی کە لە دەسـتیان دەرچـووە. چـونکە بـوونە ڕواڵەتییەکەیـان لەناوناچێت و ناسڕێتەوە، بەڵکو لە پێش چاودا ون دەبێـت. ئەمە جـگە لەوەی کە ئەو گوڵانە چەند وێنە و شێوەیەکی هەمیشە نوێبـووی حەقـیقەتە بـاقییەکەی جۆر و ڕەگەزەکەی خۆیانن..

چونکە گەڵا و گوڵ و بەروبوومەکان و شتانی هاوچەشنیان کە لە ناوەنـدی بوونەوەرانی بەهاری ڕابوردوودا بوون، کتومت هـاووێنەی بوونەوەرەکـانی ئەم بەهارەن و جیاوازییەکەیان تەنهـا شـتێکی ئیعتیبـارییە. ئنجـا تێگەیشـتم کە ئەم جیاوازییە ئیعتیبارییەش بۆ ئەوەیە کە گەلـێ واتـای جۆراوجـۆر و جیاجیـا بەم

وشـانەی دانسـت و بەم دەسـتەواژانەی میهرەبـانی و بەم پیتـانەی توانسـتی خواوەند ببەخشرێن.

ئەم تێگەیشتنە هانی دام کە لە بریی خەم خواردنم بۆ نەمانی ئەو گوڵانە، پڕ بەدەم "ماشاءَ اللّه، بارَكَ اللّه" دووپات بکەمەوە!

لە دوورەوە و، لە ڕێـی ئـیمانمەوە بە داهێـنەری ئاسـمانەکان و زەوی و، پەیوەندیم بەو بەدیهێنەرەوە، هەستم کرد کە مرۆڤ - گەر هەست و نەستی تێدا بێت - گەلێ خاوەن ڕێزە و، شایانی شـانازیکردنە و، یەکـێکە لە ئاسـەوارەکانی ئەو بەدیهێنەرە بەتوانایە و، بەدیهاتوویەکی ئەو خواوەنـدەیە کە ئاسـمانەکانی بە چرای ئەسـتێرەکان ڕازاندووەتەوە و ڕووی زەویشـی بە گـوڵزار و بەدیهـاتووە ناوازەکـانی نەخشـاندووە و، لە هەمـوو بەدیهـاتوویەکی نـاوازەی توانسـتی خۆیشیدا سەدان موعجیزەی پێش چاو خستووە..

مـرۆڤ بەهـۆی بـاوەڕبوونیەوە بەو بەدیهێـنەرە و پەیوەنـدیی لەگەڵیـدا و هەست کردنیەوە پێی، بە تایبەت گەر ئەو بەدیهێـنەرە خـاوەن ئیعجـازە ڕەهـایە کتێبی گەورەی "ئاسمانەکان و زەوی" لە نوسخەیەکی بچووکدا بنووسـێت، کە مرۆڤە و، ئەم مرۆڤەش بکات بە هەڵبـژاردە و پـوختەیەکی کـامڵی ئەو کتێـبە.. مـرۆڤ بەو ئـیمان و هەسـت و شـعوورە و، بەو پەیوەنـدییەی بە بەدیهێـنەری مەزنەوە، ئەو شەرەفمەندی و کەماڵ و نرخە بەرزەی دەست دەکەوێت.

جـا لەبەر ئەوەی ئەم دەرسـەم لە ئـایەتی پیـرۆزی ﴿حَسْبُنَا اللـهُ وَنِعْـمَ الْوَكِيـل﴾ەوە وەرگـرت و فێـری بـووم، ئەوا بە نیـاز و تەسـەووڕکردنی زمـانی سەرجەمی بوونەوەرانەوە، ئەم ئایەتە پیرۆزەم خوێندەوە!

❐ پێنجەم پلەی نووریی "حەسبی":

ماوەیەك ژیـانم لە ژێـر چەنـدین کـۆڵی قورسـدا دەیناڵانـد، بە ڕادەیەك کە ئاوڕیان بەلای ژیان و "تەمەن"ی خۆمدا پێ دامەوە.

سەرنجم دا تەمەنم ڕووەو ئەودنیا بە پەلە و خێرایی لە ڕۆیشتندایە و، ژیانی نزیکبووی ئاخیرەتیشم - لە ژێر ئەم کۆڵە قورس و تەنگ پێ هەڵچنینەدا - بەرەو کوژانەوە هەنگاو دەنێت! کەچی فەرمانبەرییە بەرزەکانی "ژیان" و تایبەتکاری و سوودە بەنرخەکانی (کە لەو پەیامەدا باس کراون لە ناوی پیرۆزی "الحَيّ" دەدوێت)[1] دەریدەخەن کە ژیان شایستەی ئەوە نییە بەم خێراییە بکوژێتەوە، بەڵکو شایستەی ژیانێکی درێژخایەنە..

لەبەر ئەوە، بە خەفەتێکی زۆرەوە بیرم لەم کێشەیە دەکردەوە و، بۆ ئەم مەبەستەش سەرێکم لە مامۆستاکەم: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ دایەوە.

ئەویش پێی وتم:

(بەو جۆرە بڕوانە بۆ ژیان کە خواوەندی "حەیی" و "قەییووم" دەیەوێت)!

منیش کاتێ بەو ڕوانینە سەیرم کرد، بۆم دەرکەوت کە:

ئەگەر "ژیان" بە تەنها یەك ڕوو بۆ من بڕوانێت، ئەوا سەد ڕوخسار و ڕووی هەیە کە پێیان دەڕوانێتە خواوەندی "زیندوو"ی "ژیانبەخش. ئەگەر تەنها بەرهەمێکی بۆ من بگەڕێتەوە، ئەوا هەزار بەرهەمی بۆ بەدیهێنەرم دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوە، تەنها ساتێکی ژیان کە لە چوارچێوەی ڕەزامەندییەکانی خوادا بێت سەروزیادی مرۆڤە و، پێویست بە ژیانێکی دوور و درێژ ناکات!

جا لەبەر ئەوەی لە بەشەکانی پەیامەکانی نووردا ئەم ڕاستییە بە بەڵگەوە ڕوون کراوەتەوە، ئەوا لێرەدا و لە ناوەندی چوار مەسەلەدا پوختەیەکی لەبارەوە باس دەکەین:

❖ *مەسەلەی یەکەم:*

سەیرێکی "ژیان"م لەو ڕووەوە کرد کە ماهیەت و حەقیقەتەکەی ڕووی لە خواوەندی "الحَيّ القَيُّوم"ە، یەکسەر بینیم و زانیم کە:

---

(١) ئەو باسە لە بریسکەی سیهەمی کتێبی "بریسکەکان" و، پەیامی "ناوی هەرە مەزنی خوای گەورە"دایە. (وەرگێڕ)

ماهییەتی "ژیانی خۆم" گەنجینەی کلیلی خەزێنەکانی ناوە جوانەکانی خوایە و.. نەخشەیەکی بچووکی نەخشونیگارە ناوازەکانی ئەو ناوانەیە و.. پێڕستێکی درەوشانەوەکانیانە و.. پێوەرێکی ورد و تەرازوویەکی هەستیارە بۆ کێشانە و تەرازووکردنی ڕاستییە گەورەکانی گەردوون و.. وشەیەکی نووسراوی دانایانەیە کە ناوە شکۆمەند و بەنرخەکانی خواوەندی حەیی و قەییوم دەناسێت و دەیانناسێنێت و لێیان تێدەگات و خەڵکیشیان لێ تێدەگەیەنێت.

جا حەقیقەتی "ژیان" کە بەم جۆرەیە، هەزاران پلەی ڕێز و نرخ و بەها بەدەست دەهێنێت، تەنانەت مانەوەی یەك سەعاتی ئەم ژیانە هێندەی تەمەنێکی درێژ گرنگیی دەست دەکەوێت.

کەواتە لە ڕووی پەیوەندیی ئەم حەقیقەتەی "ژیان"ەوە بە زاتی شکۆمەندی خاوێن لە زەمان، ئاوڕ لە کورتی و درێژیی "ژیان" نادرێتەوە!

❖ *مەسەلەی دووەم:*

سەیرێکی مافە ڕاستەقینەکانی "ژیان"م کرد، بینیم:

ژیانی من - لە ڕاستیدا - نامەیەکی پەروەردگاریی ئەوتۆیە کە خۆی دەخاتە پێش چاوی برا بەدیهاتووە خاوەن هەست و شعوورەکانم، تاکو بیخوێننەوە و.. شوێنی موتالا و خوێندنەوەیەکی وەهایە کە "بەدیهێنەری بەخشندە" بە خوێنەرانی دەناسێنێت و.. تابلۆیەکی ڕاگەیاندنە؛ کەمالاتی بەدیهێنەرم ڕادەگەیەنێت. هەروەها تێگەیشتم کە یەکێك لە مافەکانی ئەم ژیانەم بریتییە لەوەی کە لە نمایشی دووپاتبووی ڕۆژانە و لە پێش چاوی پادشای شکۆمەنددا و، بە هەست و نەستێکی تەواوەتی و، بە خۆدەرخستن و نمایشێکی هاودەم لەگەڵ ئیمان و هەست و پێزانین و شوکرانە و منەتباریدا، خۆی بەو دیاری و خەلاتە بەنرخانە بڕازێنێتەوە کە بەدیهێنەری ژیان پێی بەخشیوە و بەسەر بەرۆکیدا نەخشاندوونی.

هەروەها یەکێك لە مافەکانی ئەم ژیانە بریتییە لە پەیبردن و تێگەیشتن لە تەحیات وْ سڵاوی زیندەوەرە بێسنوورەکان کە وەسفی بەدیهێنەری خۆیانی پێ دەکەن.. هەروەها تێگەیشتنی دیاریی تەسبیحاتەکانیانە کە وەك شوکر و سەنا و سوپاس پێشکەشی خوای گەورەی دەکەن .. هەروەها بینینی ئەمانەیە و ڕاگەیاندنیانە لە ڕێی شایەتیدانەوە لەسەریان.

هەروەها یەکێك لە "مافەکانی ژیان" بریتییە لە دەرخستنی جوانییەکانی پەروەردگارێتیی خواوەندی "حەیی" و "قەییوم" بە زمانی حاڵ و گوفتار و بەندایەتی بۆکردنی.

جا ئەم چەشنە مافە بەرزانەی ژیان، خوازیاری مانەوەی دوور و درێژخایەن نین و پێویستییان پێی نییە، جگە لەوەش کە نرخ و پلەی "ژیان" هەزار جار بەرز دەکەنەوە و، سەد هێندەی مافە دنیاییەکانی ژیان بەرز و بڵندترن.

ئیتر هەر هێندەی کە ئەمەم بە "علم اليقين" زانی و لێی تێگەیشتم، وتم: سُبْحانَ اللّه! ئەم ئیمانە چەندە مەزنە و، چۆن شتانی یەکجار زۆر بە ژیان دەبووژێنێتەوە و، بڕواتە ناو هەرشتێکەوە گیانی بەبەردا دەکات، تەنانەت ڕۆشناییەکی "ئیمان" ئەم چەشنە ژیانە فانییە دەگۆڕێت بە ژیانێکی باقی و بەردەوام و، مۆری "فەنا" بەسەر ژیانەوە دەسڕێتەوە و لایدەبات!

❖ *مەسەلەی سێیەم:*

سەیرێکی ئەو سوودە مەعنەوی و فەرمانبەرییە سروشتییانەی ژیانی خۆمم کرد کە ڕوویان لە بەدیهێنەری بەخشندەمە، بینیم کە ژیانم لە سێ ڕووەوە ئەرکی ئاوێنە دەبینێت بۆ بەدیهێنەری ژیان..

❍ ڕووی یەکەم: هەموو ژیانم، بە لاوازی و کۆڵەواری و هەژاری و گشت پێداویستییەکانیەوە، ئەرکی ئاوێنەی تیشکدەرەوەی گرتووەتە ئەستۆ بۆ درەوشانەوەی توانست و، دەوڵەمەندی و، میهرەبانیی بەدیهێنەری ژیان. چونکە هەروەك پلەکانی تام چەشتن بە ئەندازەی برسێتی و، پلەکانی ڕووناکی

بەپێی پلەکانی تاریکی و، هی گەرمی بە پێوەری سەرما دەزانرێن، بە هەمان جۆریش، بەهۆی ئەو کۆڵەواری و هەژارییە بێسنوورانەی لە ژیانمدا هەن، لەو ڕووەوە کە پێداویستییە نەبڕاوەکانیان نەهێشتم و دوژمنە لەژمارەبەدەرەکانیان لەسەر ڕێ بۆ لابردم، توانستی ڕەها و میهرەبانیی فراوانی خواوەندی بەدیهێنەرم بۆ دەرکەوت و، لە فەرمانبەریی بەندایەتی تێگەیشتم و دەستم دایە نزا و لاڵانەوە و، پەنا و هانابردن و ملکەچی بۆ خوای گەورە و میهرەبان.

❍ ڕووی دووهەم: بریتییە لەوەی کە سیفەتە جوزئییەکانی ژیانم وەك واتاکانی (زانین و ویست و بیستن و بینین) و واتاکانی تری هاوچەشنیان، ئەرکی ئاوێنەی پیشاندەری سیفەتە هەمەکییە گشتگیر و کاروبارە شکۆمەندەکانی بەدیهێنەری بەخشندەم ڕادەپەڕێنن..

بەڵێ، بە لایەنە جوزئییەکانی سیفەتەکانی: زانین و بیستن و بینین و ویست و گوفتار، کە دەبن بە سیفەتی ژیانە تایبەتییەکەم و ئەو کردارە ئیختیارییانەم کە بە هەست و شعوور ئەنجامیان دەدەم، بە جوزئییاتی ئەم سیفەتانەم و بە ڕێژەی بچووکیم لەچاو گەورەیی گەردووندا، لە سیفەتە هەمەکییە گشتگیرەکانی بەدیهێنەرم تێگەیشتم، وەك سیفەتەکانی زانست و ویست و بیستن و بینین و ژیان و توانست، هەر بەم سیفەتانە لە کاروبارە شکۆمەندەکانیشی چەشنی خۆشویستن و ڕق و میهرەبانی و شەفەقەتی تێگەیشتم و، ئیمانم بەو سیفەت و کاروبارە مەزنانە هێنا و تەسدیقم کردن و شایەتیم لەسەر دان و، لە ناوەندیانەوە ڕێگایەکی ترم بۆ "ناسینی خوای گەورە" دۆزییەوە.

❍ ڕووی سێهەم: بریتییە لەوەی کە ژیانم ئەرکی ئاوێنەی لە ئەستۆ گرتووە بۆ ئەو ناوە جوانانەی کە نەخشونیگارەکانیان لەو ئاوێنەیەدا دەردەکەوێت.

بەڵێ، هەرکاتێ سەیری جەستە و ژیانی خۆمم کردبێت، سەدان جۆر ئاسەواری موعجیزات و نەخشونیگار و داهێنانم تێدا هەست پێ کردووە، جگە لەوەی کە دەبینم من بە پەروەردەیەکی لەوپەڕی شەفەقەت و میهرەبانیدا

پەروەردە دەکرێم. ئیتر بە "نووری ئیمان" زانیم کە ئەو کەسەی بەدیی هێناوم و بەردەوامی بە ژیانم دەبەخشێت، لەوپەڕی سەخاوەت و میهرەبانی و نەرمونیانی و توانست و داهێنانی ناوازەدایە و، لە واتا و ناوەرۆکی هەموو ئەو کارمەندییانەی سروشت و ئەو ئامانجانەی بەدیهاتن و ئەو ئەنجامانەی "ژیان" تێگەیشتم کە تەسبیح و تەقدیس و حەمد و سەنا و شوکر و سوپاس و تەکبیر و تەعزیم و تەوحید و تەهلیل و هاوچەشنەکانیان، ڕایاندەگەیەنن.

ئیتر بە "علم الیقین" هۆکاری ئەوەم زانی کە بۆچی "ژیان" پێشکەوتووترین بەدیهێنراوی ناو گەردوونە و، لە نهێنیی ئەوەش تێگەیشتم کە هەموو شتێك ملکەچ و گوێڕایەڵی ژیانە و، حیکمەتی ئەوەشم زانی کە بۆچی شەوقێکی سروشتی لە هەمووواندا بەرامبەر بە ژیان هەیە و، زانیم کە گیانی ژیان بریتییە لە "ئیمان"!

❖ *مەسەلەی چوارەم:*

ئایا چێژی ڕاستەقینە و بەختەوەریی ئەم ژیانەی دنیام لە چیدایە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە سەرم لەم ئایەتە پیرۆزە دایەوە کە دەفەرموێت: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾. ئیتر بینیم و لێی تێگەیشتم کە:

خاوێنترین چێژ و، پوخت و پاڵفتەترین بەختەوەریی ئەم ژیانەم تەنها لە "ئیمان"دایە! واتە ئیمانی دامەزراوی بێگومان بەوەی کە من بەدیهاتووی ئەو کەسەم بەدیی هێناوم و پەروەردەی کردووم. کەواتە من بەندە و دروستکراوی ئەو بەدیهێنەرەم و لە ژێر چاودێریی ئەودام و هەمیشە پێویستیم پێیەتی و، هەر تەنها ئەو بەدیهێنەرە پەروەردگار و خواوەندی بەسۆز و میهرەبانمە.

جا ئەم ئیمانەم، چێژێکی هێندە سەروزیاد و بەردەوامە کە هیچ چێژێکی تری لە دوا نییە و، بەختەوەرییەکی هێندە بێگەرد و خاوێنیشە کە هیچ ئازارێك لێڵی ناکات. ئیتر لەم ئایەتە پیرۆزەوە ڕادەی شایستەیی ئەم دەستەواژەیەم بۆ دەرکەوت کە دەڵێت: "الحَمْدُ لِلّهِ علىَ نِعْمَةِ الإيمان".

بەم جۆرە، ئەم چوار مەسـەلانەی کە تـایبەتن بە حەقـیقەت و، مافەکـان و، کارمەندییەکان و، لەزەتە مەعنەوییەکەی ژیان، دەریانخست کە:

"ژیان" هەتا بڕوانێتە خـوای گەورەی "حەیـی" و "قەیـوم" و "بـاقی" و، ئەو خوایە مەبەست بێت لە ژیاندا.. هەتا ئیمان "ژیان" و "گیان"ی ژیان بێـت، ئەوا ژیان "مان"ی دەست دەکەوێت و بەروبوومی مانەوە و هەمیشەیی دەبەخشێت. تەنـانەت هێنـدە بەرز دەبێـتەوە تـا دەگـاتە ئەو پـلەیەی کە درەوشـانەوەی "نەبڕاوەیی"(سەرمەدییەت) بەدەسـت بهێنێـت. دیـارە ئەو کـاتەش ئـاوڕ بەلای کورتی و درێژیی تەمەندا نادرێتەوە!

بەڵێ، بەم جۆرە لەم ئایەتە پیرۆزە تێگەیشتم و دەرسم لێ وەرگـرت. ئیـتر لە نییەت و تەسەوور و ئەندێشەی خۆمـدا، بە نـاوی هەمـوو جۆرەکـانی ژیـان و سەرجەمی زیندەوەرانەوە، ئەم ئایەتەم خوێندەوە:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾!

### ❑ شەشەم پلەی نووریی "حەسبی":

لە ناوەندی ئەو پیرییەی کە جودایی تـایبەتیی خـۆمم یـاد دەخـاتەوە و.. لە نێوان جوداییە گەورە و گشتییەکاندا کە هەواڵـی ڕووداوەکـانی ئـاخر زەمـان و کاولبوونی دنیا ڕادەگەیەنن و.. لە ناوەندی گەشەکردن و دەرکەوتنی لەعـادەت بەدەری هەسـتەکانم لە کۆتـایی تەمەنمـدا بە شـێوەیەکی فـراوان سـەبارەت بە جوانی و عاشقبوونی ئەو جوانییە و شەیدایی ناخی سروشتم بۆ کەمـاڵات.. لە ناوەندی هەموو ئەمانەدا، بینیم ئەو "نەمان"ەی کە هەمیشە خەریکی ڕووخان و کـاولکردنە و، ئەو "مـردن" و "نەبـوون"ەش کە بەردەوام جـودایی دەنێـنەوە، بە شـێوەیەکی سـامناك جـوانیی ئەم دنیـا جـوان و ڕازاوەیە دەشـێوێنن و، بە تێکشـکاندنیشـی ناشـیرینی دەکەن و، ناسـك و نیـانی و جـوانیی ئەم بەدیهاتووانەش لەناودەبەن!

کە ئەمەم بینی، لە قووڵایی ناخی خۆمەوە ئازارێکی گەلێ قورس و لەڕادەبەدەرم چەشت و، لە بەرامبەر ئەم کارەساتە ناهەموارەوە عیشقی مەجازیی ناو سروشتم کەوتە هەڵچوون و ملنەدان و سەرپێچی! هیچ چارەیەکیشم بە دەستەوە نەبوو بۆ ڕزگاربوون لەم بارە پەرێشانە و دڵدانەوەی خۆم جگە لە سەردانەوەم لەم ئایەتە پیرۆزە..

ئەویش پێی وتم:

(بە جوانی بمخوێنەرەوە و، لە واتاکانم ورد بەرەوە).

منیش ڕۆشتمە ناو ڕوانینگا(مَرْصَد)ی سوورەتی نوور لە ئایەتی **﴿اللّـهُ نُورُ السَّموات وَالأرْضِ﴾**دا..

لەوێ بە دووربینی ئیمان ڕوانیمە دوورترینی چینەکانی ئایەتی "حەسبی" و، بە وردبینی هەستی ئیمانیش سەیری وردترین نهێنییەکانیم کرد.. بینیم:

هەروەك ئاوێنە و شووشە و هەموو شتێکی ساف و بریقەدار، تەنانەت کەف و بڵقی سەر دەریاکانیش، جوانیيە پەنهان و ڕەنگاوڕەنگەکەی "خۆر" دەردەخەن و، هەریەکەیان چەندین جۆری جوانیی حەوت ڕەنگەکەی ئەو ڕووناکییە پیشان دەدەن.. هەروەها وەك بە گوێرەی تازەبوونەوە و جووڵانەوەی ئەو ماددانە و بەپێی توانا و قابیلییەتیان و شکانەوەی جۆراوجۆریان، ئەو جوانییەی "خۆر"یش تازە دەبێتەوە و بە شێوەیەکی ڕازاوەی سەرنج ڕاکێش جوانیی پەنهان و حەوت ڕەنگەکەی تیشکی خۆر دەردەخەن..

ئەو بەدیهاتووە ناسکۆڵە و جوانانەش کە لە جێگای ئاوێنەدان و، جوانیی خاوێن و پیرۆزی خوای گەورەی جوان و شکۆمەندیان تێدا دەدرەوشێتەوە کە ڕووناکیی ئەزەل و ئەبەدە.. بە هەمان جۆر و بە بێ وەستان، هەر لە هاتن و ڕۆیشتندان و، بەمەش درەوشانەوەی ئەو جوانییە هەمیشەییەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە تازە دەکەنەوە!

کەواتە ئەو جوانییە درەخشان و ئاشکرایەی کە بەسەر ڕوخساری ئەم بوونەوەرانەوە دەبینرێت - لە ڕاستیدا - موڵکی خۆیان نییە، بەڵکو ئاماژە بۆ ئەو جوانییە خاوێن و هەمیشەییەی خواوەند دەکەن کە داخوازی خۆپیشاندانن و، ئاماژە و نیشانە و درەوشانەوەی ئەو جوانییە پاك و بێگەردەن کە دەیەوێت بە ئاشکرا ببینرێت و پیشانی کەسانی تریش بدرێت.

ئەمەشمان بە بەڵگە بەهێز و گومانبڕەکانیەوە و بە درێژی لە پەیامەکانی نووردا ڕوون کردووەتەوە. بۆیە لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی کورت بۆ سێ دانە لە بەڵگەکانی دەکەین:

◆ *بەڵگەی یەکەم:*

جوانیی هەر ئاسەوار و سنعەتێك بەڵگەیەکی بێگومانە لەسەر جوانیی سنعەت و دروستکردنی.. ئەم جوانی و وردەکاریی سنعەتەش بەڵگەیە لەسەر جوانیی ئەو ناونیشانەی سنعەتکارەکەی کە لەو سنعەتەوە پەیدا بووە.. جوانیی ناونیشانی سنعەتکاری وردەکاریش بەڵگەیە لەسەر جوانیی ئەو سیفەتەی سنعەتکار کە تایبەتە بەو سنعەتەوە.. ئەم جوانیی سیفەتەشی بەڵگەیە لەسەر جوانیی توانا و لێهاتنەکانی.. جوانیی توانا و لێهاتنەکانیشی بەڵگەیە لەسەر جوانیی زات و حەقیقەتەکەی.

هەروەك ئەم بەڵگانە ڕوون و ئاشکرا و بەدیهین..

بە هەمان جۆر، جوانیی ئاشکرای بەدیهاتووە جوانەکانی سەرانسەری ئەم جیهانە و ئەو سنعەتە ناوازەیەش کە لە بەدیهاتووە جوانەکاندا دەبینرێت، هەر هەموویان شایەتیی بێگومان دەدەن لەسەر جوانیی کارەکانی سنعەتکار و کردگاری شکۆمەند.. جوانیی ئەم کردارانەشی بێگومان بەڵگەیە لەسەر جوانیی ئەو ناونیشانانەی کە سەرپەرشتیی ئەو کارانەیان کردووە، واتە لەسەر جوانیی ناوەکانی.. جوانیی ناوەکانیش شایەتییەکی بێگومان لەسەر جوانیی ئەو سیفەتە موقەددەسانەی دەدەن کە سەرچاوەی ئەو ناوانەن.. هەروەها جوانیی

سیفەتەکانیش شـایەتێکی بێگومـانن لەسـەر جـوانیی کاروبـارە زاتییەکـانی کە سەرەتا و بنەمای ئەو سـیفەتانەن.. هەروەهـا جـوانیی کاروبـارە زاتییەکـانی، بە جۆرێکی ئاشکرا و بەدیهـی، بەڵـگە و شـایەتی بێگومـانە لەسـەر جـوانیی ئەو زاتەی کە بکەر و خـاوەنی ئەو نـاو و سـیفەتانەیە و، بەڵـگەیە لەسـەر کەمـاڵی خاوێنی ماهییەت و جوانیی موقەددەسی حەقیقەتەکەی.

واتە ئەو سـنعەتکارە کردگـارە، جـوانییەکی بێسـنووری ئەوتـۆی هەیە کە شایانی زاتی خاوێنی ئەو بێت، بە ڕادەیەك کە تەنها سێبەرێکی "جـوانی"یەکەی سـەرجەمی ئەم بـوونەوەرانەی جـوان کـردووە و، تەنهـا یەك درەوشـانەوەشی جوانیی بە سەرانسەری گەردوون بەخشـیوە و بـازنەی هەمـوو بـوونەوەرانی بە بریسـکانەوەی "جـوانی" ڕوونـاك کـردووەتەوە و بە جـوانترین ئارایشـتیش ڕازاندوویەتەوە.

بەڵێ، هەروەك ناگونجێ کە هیچ ئاسەوار و سنعەتێك بە بێ "کار" دروست بووبێت، بە هەمان جۆر ئەو کارەش ناگونجێ بەبـێ "بـکەر" پەیـدا بووبێـت.. هەروەها وەك مەحاڵە "ناو"ی بێ خاوەن ناو ببێت، بە هەمـان جـۆر مەحاڵیشـە کە "سیفەتەکان" بەبێ "سیفەتدار"(مەوسووف) بن..

جا مادەم "بوون"ی هەر سنعەت و ئاسەوارێك بە ڕوونی بەڵگە بێت لەسەر "کار"ی بکەری ئەو سـنعەت و ئاسـەوارە و، ئەو کـارەش بەڵـگە بێـت لەسـەر "بـکەر"ی خـۆی و "ناونیشـانەکانی" و ئەو "سـیفەتانە"ی کە ئەو ئاسـەوارەیان بەرهەم هێناوە و لەسەر "نـاو"ەکەشی، ئەوا بێگومـان "کەمـاڵ و جـوانیی" هەر سنعەت و ئاسەوارێك بەڵگەیە لەسەر کەمـاڵ و جـوانیی تـایبەت بەو کـارە و، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کەماڵ و جوانیی ئەو ناوەی کە شـایانیەتی و، ئەمەش بە چەشنێکی بێگومـان و بەدیهـی و بە "علـم الیقـین" بەڵـگەیە لەسـەر کەمـاڵ و جـوانیی "زات" و "حەقـیقەت" بە چەشـنێك کە شـایان و گونجـاوی زات و حەقیقەت بن.

بە هەمـــان جــۆر، ئەم کـــارایی(فَعّالِیّـــة)یە بەردەوامەش کە لە ناوەنـــدی پەردەکانی ئەم ئاسەوارە نـاوازانەوە دەبیـنرێن، هەروەك مەحـاڵە کە بکەرێکیـان نەبێـــت، بە هەمـــان جـــۆر مەحـــاڵە درەوشـــانەوەی ئەم نـــاوانەش، کە نەخشونیگارەکانیان بەم بەدیهاتووانەوە دەبینرێت، خاوەن ناوێکیان نەبێت..

بە هەمان جۆر توانست و ویست و سیفەتە مەزنەکانی تـری هاوچەشـنیان، کە وەك بە چاو بیانبینیت هێندە بە بێگومـانی هەسـتیان پـێ دەکەیـت، مەحـاڵە بەبێ "سیفەتدار" بن.

لەبەر ئەوە، سەرجەمی ئاسـەوار و بەدیهـاتووان و دروسـتکراوانی نـاو ئەم گەردوونە، بە "بوون"ە بێسنوورەکانی خۆیان بەڵگەی بێگومانن لەسەر "بـوونی کارەکان"ی بەدیهێنەریان و، لەسەر "بکەر"ی ئەو کارانە و، لەسەر بوونی نـاو و سیفەتەکان و کاروبارە زاتییەکانی ئەو بکەرە و، لەسـەر پێویسـتیی بـوونی زاتی موقەددەس و شکۆمەندی ئەو.

هەروەها هەرچی جـۆرە جیاجیاکـانی "کەمـاڵ" و چەشـنە ڕەنگاوڕەنـگ و جۆراوجۆرەکـــانی "جـــوانی" بەســـەر بەدیهـــاتووانەوە دەبیـــنرێن، هەموویـــان بەڵگەیەکن لەوپەڕی بێگومانیـدا و، شـایەتییەکی لەوپەڕی ڕاشکاویشـدا دەدەن لەسەر:

کەماڵاتی بێسنوور و جوانییە نەبڕاوەکانی کارەکانی کردگاری شـکۆمەند و، ناوەکانی و، سیفەت و کاروبارەکانی و، زاتی خـاوێن و پیـرۆزی، بە چەشـنێك کە شایستە و گونجاوی "خاوێنی" و "وجووب" و "بەرزی و بڵندی"ی ئەو زاتە موقەددەس و خاوێنە بێت..

هەروەك بەڵگەشـــن لەســـەر جـــوانییەکی جۆراوجـــۆری هێنـــدە بڵنـــد کە لە سەرجەمی گەردوون بەرز و بڵندترە.

◆ بەڵگەی دووهەم:

پێنج خاڵی تێدایە:

● خاڵی یەکەم:

سەرجەمی پێشەوایانی ئەهلی حەقیقەت - سەرەڕای جیاوازیی مەشرەب و دووریی ڕێبازەکانیشیان - لە ڕێی پشت بەستنیان بە چێژ و کەشفەکانیان و، بە یەکگرتن و یەکدەنگییش بڕیاریان داوە و باوەڕیان وایە کە هەرچی "جوانی" لە بوونەوەراندا هەیە، هەر هەموویان بریتین لە تەنیا یەك سێبەری تەنیا یەك جوانیی خاوێنی خواوەندی "واجب الوجود" و، تێکڕا درەوشانەوەی ئەو سێبەرەن لە پشت پەردەکانەوە.

● خاڵی دووهەم:

هەموو بوونەوەرە جوانەکان، بە شێوەی کاروانی یەك لە دوای یەك دێنە ناو ئەم جیهانە و، پاشان بەجێی دەهێڵن و لە ئاسۆی نەماندا ئاوا دەبن. بەڵام ئەو جوانییە بەرز و خاوێن و بێ ئاڵوگۆڕەی کە بە درەوشانەوە و دەرکەوتنی لەو ئاوێنانەدا خۆی دەردەخات، هەر دەمێنێتەوە و بەردەوامە. ئەمەش بەڵگەیەکی بێگومانە لەسەر ئەوەی کە ئەو جوانییە موڵکی ئەو شتە جوانە فانییانە نییە و جوانییەکەش هی ئەو ئاوێنانە نییە، بەڵکو چەند تیشکێکی جوانییەکی هەتاهەتایین. بە وێنەی ئەوەی کە بەردەوامیی جوانیی تیشکی خۆر لە بڵق و کەفەکانی ئاوی بەخوڕدا دەبێت بە بەڵگە لەسەر جوانیی بەردەوامی ئەو خۆرە.

● خاڵی سێهەم:

هەروەك هاتنی نوور لە لایەن "نووراني" و، وجوود لە لایەن "مەوجوود" و، چاکەکاری لە لایەن "دەوڵەمەند" و، سەخاوەت لە "سەروەت" و، فێرکردنی زانستیش لە لایەن "زانست"ەوە، چەند شتێکی بەدیهی و ئاشکران.. هەر بە هەمان جۆر، هاتنی "جوانی" و "بەخشینی جوانی"یش هەر لە لایەن "جوان"ەوە دەبێت و، وەك ئەوانەی پێشوو کارێکی بەدیهی و ئاشکرایە..

جا لەسەر بناغەی ئەم حەقیقەتە، باوەڕمان وایە و دەشڵێین کە:

هەرچی جۆری "جوانی" بە سەرانسەری بوونەوەرانەوە دەبینرێن، هەموویان لە لایەن "جوان"ێکەوە دێن کە هەرگیز جوانییەکەی بڕانەوە و کۆتایی بۆ نییە، بە ڕادەیەك کە ئەم بوونەوەرە هەمیشە بگۆڕ و بەردەوام نوێبووانە، چ لە ڕێی هەموو بـوونەوەرانی نـاویەوە و چ بە زمانەکـانی ئەنجامـدانی ئەرکی "ئـاوێنە"ی ئەو جوانییە، وەسفی ئەو جوانە دەکەن و بە خاوەن هەستانی دەناسێنن.

● خاڵی چوارەم:

هەروەك جەستە پاڵ بە "گیان"وە دەدات و بەو ڕاگیر دەبێت و ژیانی بەبەردا دەکرێت..

هەروەك وشە بەپێی "واتا" ڕووناکی بەدەست دەهێنێت..

هەروەك وێنە و شێوە پاڵ بە "ڕاستی"یەکەوە دەدات و، نرخ و بەهـاکەی لەو ڕاستییەوە وەردەگرێت..

ئەم جیهانە بینراوە بەرجەستە و ماددییەش بە هەمان جۆرە؛ جەستە و وشە و وێـنەیەکە پاڵیـان بەو "نـاوە جوانـانەی خواوەنـد"ەوە داوە کە لە پشـت پەردەی جیهانی غەیبەوە داپۆشراون.

کەواتە ئەم جیهانە بەو ناوانە دەژی کە گەرموگوڕی و ژیـان و تینـی بەبەردا دەکەن و، جیهان هەمیشە ڕووی لەو ناوانەیە بۆیە هەردەم جوانی و قەشـەنگیی زیاد دەکات!

واتە هەموو جۆرەکانی جوانیی ماددی لە جوانیی مەعنەویـی واتاکانیـانەوە سـەرچاوەیان گرتـووە. بەڵام حەقیقەتەکـانی ئەو جوانییـانە ڕێـژنەی "نـاوە جوانەکانی خواوەند"ن و جۆرە سێبەرێکن بۆ ئەو ناوانە.

ئەم حەقیقەتەش، بە جۆرێکی بێگومان، لە پەیامەکانی نووردا چەسپێنراوە.

بەو واتایەی کە هەرچی جۆری ڕەنگاوڕەنگی "جوانی" لە گەردووندا هەیە، هەر هەموویان درەوشانەوە و ئاماژەی جوانییەکی خاوێنی بێقسووری ناماددیی

ئەوتـۆن کە بەهـۆی چەنـد نـاوێکەوە لە پشـت پەردەی جیهـانی غەیـبەوە دەردەکەوێت و دەدرەوشێتەوە..

بەڵام هەروەك زاتی موقەددەسی خوای گەورە هەرگیـز لە هـیچ زاتـێکی تـر ناچێت و سـیفەتە خاوێن و شکۆمەندەکانیشـی وەك هی سـیفەتی مومکینـات نـین، بە هەمـان جـۆر جـوانییە خـاوێنەکەشی هەرگیـزاو هەرگیـز لە جـوانیی بـوونەوەران و مومکینـات ناچێـت. بەڵکـو جـوانییەکی گەلـێ بەرز و بڵنـد و موقەددەس و ڕەهایە.

بەڵـێ، ئەگەر بەهەشــتی ڕەنگــین، بە هەمــوو جــوانی و قەشــەنگی و نایابییەکیەوە، تەنها یەك درەوشانەوەی جـوانیی ئەو خواوەنـدە بێـت و، بینینـی جوانیی خوای گەورە لە لایەن خەڵکی بەهەشـتەوە بـۆ مـاوەی یەك سـەعات، هەموو جوانییەکی تەنانەت ئەو بەهەشتە جوان و ڕەنگینەشـیان لە بیـر ببـاتەوە، ئەوا بێگومـان ئەم "جـوانی"یە هەمیشـەییە جـوانییەکی نەبـڕاوە و بـێ هـاووێنە دەبێت!

ئاشکرایە کە جوانیی هەرشتێك بەپێی خودی ئەو شـتە دەبێـت و لەگەڵیـدا دەگونجێت. هەروەها ئاشکراشە کە هەزاران جـۆری جـوانی هەیە و بە وێـنەی جیاوازیی جۆرەکانی بوونەوەران ئەوانیش جیاجیا و جۆراوجۆر دەبن..

بۆ نموونە:

ئەو جوانییەی کە چاو هەستی پێ دەکات هەرگیز لەو جـوانییە ناچێـت کە گوێ هەستی پێ دەکات..

ئەو جوانییە عەقڵییەی کە ژیری پەیی پێ دەبات وەك جـوانیی ئەو خـۆراکە نییە کە دەم دەیچێژێت و پێی دەزانێت..

ئەو جوانییــانەش کە "دڵ" و "گیــان" و ســەرجەم هەســتەوەرە ڕواڵەتی و پەنهانەکان هەسـتییان پـێ دەکەن، لەنـاو خۆیانـدا جیاجیـا و جۆراوجـۆرن بە وێنەی جیاوازیی ئەو هەست و نەستانە.

هـەروەهـا بۆ نموونە: جـوانییەکانی ئـیمان و، حەقـیقەت و، ڕوونـاکی و، گوڵ و، گیان و، شـێوە و، شـەفەقەت و، دادگەری و، دانسـت و، میهرەبـانی، جیاجیا و جۆراوجۆرن..

جا هەروەك هەموو یەکێك لە جۆرەکـانی ئەم جوانییـانە لەوانی تـر جیـایە، جـوانیی نـاوە جوانەکـانی خواوەنـدی شـکۆمەند و خـاوەن جـوانییش - کە جوانییەکی ڕەهایە - بە هەمان جۆر، جیاواز و جۆراوجۆرن. هەر لەبەر ئەمەشـە کە جوانییەکانی بوونەوەران لە یەك ناچن و جۆراوجۆر و جیاوازن.

ئەگەر حەز دەکەیت یەك درەوشـانەوەی جـوانیی خواوەنـدی شـکۆمەند و خـاوەن جـوانی ببینیـت، کە لەنـاو ئاوێنەکـانی بوونەوەرانـدا دەردەکەون، ئەوا فەرموو بە چاوێکی ئەندێشەیی فراوان سەیری ڕووی زەوی بکە، دەبینیـت وەك باخچەیەکی بچووك وایە لە پێش چاوتدا..

هەروەها بزانە کە "ڕەحمانییەت" و "ڕەحیمییەت" و "دانایی" و "دادگەری" و دەستەواژەکانی تری هاوچەشنیان، تەنها چەند ئاماژەیەکن بۆ ناوەکـانی خـوای گەورە و، بۆ کردار و سیفەت و کاروبارە شکۆمەندەکانی.

ئەوەتا سەیری ڕۆزیی زیندەوەران - لە پێشەکیی هەموویانەوە هـی مـرۆڤ - بکە، کە بە ڕێکوپێکییەکی ناوازە لە پشت پەردەی غەیـبەوە ڕەوانە دەکرێـت و.. بۆ خۆت جوانیی "ڕەحمانییەت"ی خوای گەورەی تێدا ببینە..

هەروەها سەیری ژیاندنی دەراسای سەرجەمی وردیلە و بێچووەکـان بـکە، کە وەك ئـاوی سـازگار و خـاوێنی بەهەشـت لە ڕاسـتی سـەریانەوە و لە سەرچاوەی مەمکی دایکانیانەوە پوخت و خاوێنترین و بەلەزەتترین خۆراکیـان بـۆ خـوڕ دەبێـتەوە.. ئیـتر تـۆش بـۆ خـۆت جـوانیی سـەرنج ڕاکێشـی "ڕەحیمییەت"ی پەروەردگاری تێدا ببینە..

هەروەهـا سـەیری گشـت جۆرەکـانی بـوونەوەران بـکە و ببیـنە کە چـۆن "دانستی خواوەنـد" وەك کتێبـێکی گەورە و ڕەوانی حـیکمەتی لـێ کـردووە، بە

چەشنێك کە هەموو پیتێکی سەد وشەی لەخۆ گرتووە و، هەموو وشـەیەکیشی سـەدان دێڕی تێدایە و، هەموو دێڕێکیشـی هەزار و یەك باب و، هەر بابێکیشی هەزاران کتێبی بچووکی تێدایە.. ئیتر بۆ خۆت جوانیی بـێ وێـنەی "دانـایی"ی خواوەندی تێدا ببینە..

هەروەها سەیری هەموو گەردوون بکە؛ ئەوەتا "دادگەریی خواوەند" هەموو بوونەوەرانی خستووەتە ژێر باڵی تەرازووی خۆی و، هاوسەنگیی تەن و قەبـارە بەرز و نزمەکان ڕادەگرێت و، گونجاوی و هـاوڕێژەییەکی ئەوتۆشـیان دەداتـێ کە گرنگترین بناغەکـانی جـوانییە و، هەمـوو شـتێك لە باشـترین و جـوانترین بارودۆخدا دادەنێت و، مافی ژیان بە هەمـوو خـاوەن ژیانێـك دەبەخشـێت و، حەق لە شـوێنی ڕەوای خۆیـدا ڕادەگرێـت و، سـنوور و سـزاش بـۆ سنوورشـکاندنی ئەوانەش دادەنێـت کە دەسـتدرێژی دەکەن.. ئیـتر بـۆ خـۆت لەمانەوە جوانیی ڕەنگینی ئەم "دادگەری"یە خواییە ببینە..

هەروەها سەیری مـرۆڤ بـکە؛ ئەوەتـا خـوای گەورەی پارێزگـار مێـژووی ژیانی پێشووی ئەوی لە هێزی پارێزکار و یاد و بیری ئەودا - کە هێندەی دەنـکە گەنمـێکە - نووسـیوەتەوە و، مێـژووی ژیـانی ئاینـدەی هەمـوو ڕووەك و درەختێکیشی لە ناوك و تۆوەکانیاندا هەڵگرتووە و، ئەو ئامراز و ئـامێرانەشی بە هەموو زیندەوەرێك بەخشیوە کە بۆ پارێزگـاریـی ژیـانی یـارمەتیی بـدەن. بـۆ نموونە؛ سەیری باڵی هەنگ و چزووی پێوەدانەکەی بکە و، بۆ ڕمە باریکەکانی گوڵە دڕکاوییەکان و توێکڵە ڕەقەکـانی تۆوەکـان بـڕوانە و.. ئیـتر لەمـانەوە بـۆ خۆت جوانیی ناسك و نیانی "پارێزگاری"ی پەروەردگارانە ببینە..

هەروەها بۆ میوانداریەکانی خوای بەخشندە و میهرەبان بڕوانە، کە لەسـەر سفرە و خوانی سەرانسەری زەویدا دانراون و.. سەیری بـۆن و بەرامە خـۆش و جۆراوجـۆر و، ڕەنـگە جـوانە جیاجیاکـان و، تـام و چێـژە بەلەزەت و جۆراوجۆرەکانی ئەم خواردەمەنییە بێسنوورانە بکە و، ئنجا بە وردی سـەرنج لە

ئامێرەکانی هەموو زیندەوەران بدە کە چۆن لەگەڵ چێژ و لەزەتەکانی ژیانیدا دەگونجێن.. ئیتر بۆ خۆت لەم ڕێیەوە ئەو جوانییە شیرین و ناوازەیەی "ڕێزلێنان" و "کەریمییەت"ی پەروەردگاری ببینە..

هەروەها سەیری شێوەی ناوازە و سەرتاپا دانستی زیندەوەران بە تایبەت مرۆڤ بکە، کە لە نوتفەی خودی ئەو زیندەوەرانە و بە درەوشانەوەی دوو ناوی "الفَتّاح" و "المُصَوِّر" دەپشکوێن و دەنەخشێن. ئنجا سەرنج لە ڕوخساری جوانی گوڵانی بەهار بدە کە لەوپەڕی سەرنج ڕاکێشاندان و لە چەند تۆوێکی تابلێی بچووکەوە دەپشکوون.. ئیتر بۆ خۆت لەمانەوە جوانیی ئیعجازبەخشی "فەتتاحییەت" و "موصەوویرییەت"ی خواوەند ببینە.

جا بە وێنەی ئەم نموونانەی باس کران، هەموو یەکێکی ناوە جوانەکانی خوای گەورە جوانییەکی خاوێن و موقەددەس و تایبەت بە خۆی هەیە، بە ڕادەیەك کە تەنها یەك دەرکەوتن و درەوشانەوەی ئەو جوانییەی هەرکام لەو ناوانە جیهانێکی گەورە و کامڵ جوان دەکات و، ئارایشت و جوانی بە جۆرە بەدیهاتوویەکی بێسنوور دەبەخشێت.

جا هەروەك درەوشانەوەی جوانیی یەکێك لەو ناوانە لە یەك دانە گوڵدا دەبینرێت، بەهاریش بە هەمان جۆر گوڵێکە و، بەهەشتیش گوڵێکی ترە کە چاو نایبینێت.

جا ئەگەر دەتوانیت سەیری هەموو بەهار بکەیت و بە چاوی ئیمان بەهەشت ببینیت، ئەوا فەرموو بڕوانە و ببینە تاکو بۆ خۆت لە مەودای مەزنیی "جوانیی سەرمەدی" تێبگەیت!

خۆ ئەگەر ئەو جوانییە ڕەنگینە لە بەرامبەر جوانیی ئیمان و جوانیی بەندایەتیدا ڕابگریت، ئەوا دەبێت بە جوانترین بەدیهاتوو لە جوانترین شێوەدا! بەڵام ئەگەر چەپەڵیی بێسنووری گومڕایی و، ناشیرینیی بێزلێکراوی

سەرسەختی و ملنەدانت لە بەرامبەر ئەو جوانییەوە بەکارهێنا، ئەوا لە ناوەرۆکدا دەبیت بە ناشیرینترین و بێنرخترین و بێزلێکراوترین بەدیهاتوو لە بەردەم هەموو بوونەوەرە جوان و ڕەنگینەکاندا.

● خاڵی پێنجەم:

کەسێکی گەورە کە سەدان کارامەیی و داهێنان و تایبەتکاری و کەماڵات و لایەنی جوانیی هەیە، کۆشکێکی گەورە و ناوازەی بنیات نا تاکو لەم ڕێیەوە کارامەیی و داهێنان و سنعەتی ورد و کەماڵات و جوانییە پەنهانەکەی خۆی بە خەڵکی بناسێنێت، ئەمەش بەپێی ئەو دەستوورەی کە دەڵێت:

(هەموو کارامەییەك خوازیاری ڕاگەیاندنی خۆیەتی و، گشت سنعەتێکی ورد و جوانیش دەیەوێت کەسانی تر بۆ نرخشناسی و ڕێزلێنانی هان بدات و، هەموو کەماڵ و تایبەتکاری و جوانییەکیش دەیانەوێت و هەوڵی ئەوە دەدەن کە خۆیان پێش‌چاو بخەن).

بێگومان هەرکەسێك ئەم کۆشك و تەلارە پڕ لە موعجیزە و کارە دەراسایانە دەبینێت، یەکسەر بیری بۆ لای وریایی و کارامەیی وەستای بەننا و، بۆ لای داهێنان و وردەکاریی خاوەنەکەی و، جوانی کەماڵات و تایبەتکارییەکانی ئەو خاوەن کۆشکە دەڕوات. بە ڕادەیەك کە ئەم تێڕامانەی وای لێ دەکات تەسدیقی ئەو فەزڵ و تایبەتکارییانە بکات و وەك بە چاوی خۆی بیانبینێت ئاوا باوەڕیان پێ بهێنێت. چونکە لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

(کەسێك گەر لە هەموو ڕوویەکیەوە جوان نەبێت و لە هەموو کاروبارێکیدا داهێنەر نەبێت، هەرگیز ناتوانێت سەرچاوەی هەموو لایەن و ڕوویەکی ئەم کۆشکە ناوازەیە و بنیاتنەر و بەدیهێنەر و داهێنەری - واتە بێ چاولێکەریی - ئەم کۆشکە بێت. بەڵکو کەماڵات و جوانییە مەعنەوییەکانی ئەو بنیاتنەرە هێندە ڕوونن کە دەڵێی لەم کۆشکەدا بەرجەستە بوون)!

بەڵێ، گەر کەسێك ئەو کۆشکە ببینێت، ئاوا دەڵێت و وا بڕیار دەدات.

جـا هەروەك ئەمە لەم كۆشـكەدا وایە، بە هەمـان جـۆر ئەو كەسـەش كە سـەیری جـوانیی ئەم جیهـانەی گەردوون دەكـات، كە پیشـانگایەكی نـاوازە و كۆشك و تەلارێكی فـراوان و پـڕ لە بەدیهـاتووی سەرسـووڕهێنەرە، بێگومـان یەكسەر بیری دەڕوات بۆ لای ئەوەی كە ئەم كۆشكەی وا بەم جـوانییە ڕەنگیـنە ڕازاوەتەوە، دەبێـت ئـاوێنەیەك بێـت بـۆ ڕەنگـدانەوە و دەرخسـتنی جـوانی و كەماڵی غەیری خۆی. بە مەرجێك ئەو كەسە دڵ و ژیریی تێكنەچووبێت!

بەڵێ، مادەم ئەم كۆشكەی جیهان هیچ هاوێنەیەكی نیـیە تـا جـوانیی لـێ وەربگیرێت و لاسایی بكرێتەوە، ئەوا بێگومان بەدیهێنەر و بنیاتنەرەكەی هێنـدە جوانیی شایستە و شـایان لە زاتی خـۆی و نـاوە جوانەكانیـدا هەیە كە هەمـوو جیهان "جوانی"ی خۆیان لەو وەربگرن! لەبەر ئەمەشە كە ئەم جیهـانەی بەپێـی ڕووناكییەكانی ئەو جوانییە بنیات نـاوە و، بە وێـنەی كتێبـێكی ورد و نـاوازەش نووسراوەتەوە، تاكو گوزارشت لەو جوانییە بكات و دەری ببڕێت.

◆ *بەڵگەی سێهەم:*

سێ سەرنجی تێدایە.

* سەرنجی یەكەم:

ئەم سەرنجە بریتییە لەو ڕاستییەی كە لە هەڵوێسـتی سـێهەمی "وتەی سی و دووهەم"دا بە درێژەپێدانێكی تابڵێی جوان و هـاودەم لەگەڵ چەنـدین بەڵـگەی بەهێزدا، باس كراوە. بۆیە ئەو درێژەیە بەو پەیامە نـاوبراوە دەسـپێرین و، لێـرەدا بەم شێوەیەی خوارەوە تەنها چەند پوختە ئاماژەیەكیان بۆ دەكەین:

ئێمە كە سـەیری ئەم بەدیهـاتووانە، بە تـایبەت زینـدەوەران و ڕووەكەكـانی پێش‌چاومان دەكەین، دەبینین:

ئارایشـتدانێكی بەردەوام و، جـوانكردنێكی نیـان و، ڕێكخسـتنێكی وردی ئەوتـۆ كە هەرگیـز نـاخرێتە ئەسـتۆی ڕێـكەوتەوە، بەسـەر هەموویانـدا زاڵ و

فەرمـانڕەوایە. دیـارە ئەمەش "ویسـت" و "ئامـانج" و "زانسـت" و "دانسـت" دەردەخات لەو بەدیهاتووانەدا..

هەروەها کە سەرنج دەدەین:

سنعەتێکی ورد و، دانستێکی ناسـك و، ئارایشـتێکی بەرز و، تەرتیبـدانێکی بەشەفەقەت و، دانان و بارودۆخێکی شیرین لە هەموو شـتێکدا دەبینـین، تـاکو سەرنجی سەرسووڕمان و ڕەزامەندیی بینەران بۆ ئەو سنعەتە ڕابکێشن. ئەمەش بە ڕوونی تێمان دەگەیەنێت کە "بەدیهێنەر"ێکی ناوازە لە پشت پەردەی غەیبەوە هەیە کە دەیەوێت بە دەرخسـتنی گەلـێ داهێنـان و کەمـاڵی خـۆی لە هەمـوو سنعەتەکانیدا، خۆی بە خاوەن هەستان بناسێنێت و، لای ئەوان خۆشەویسـتی بکات و، بەرەو سەنا و ستایشکردنی بیانداتە بەر..

هەروەها دەبینرێت کە ئەو "بەدیهێنەر"ە بە چاکەکاریی خۆی، بـێ ئەوەی لە حسابی بەدیهاتووانیـدا بووبێـت و بە چەشـنێك کە هەرگیـز نەکرێـت بخـرێتە ئەسـتۆی ڕێـکەوتەوە، گەلـێ جـۆری نـیعمەتە خـاوێن و بەلەزەتەکـان بەو بەدیهـاتووانەی خـۆی دەبەخشـێت، تـاکو ئەو بەدیهـاتووە خـاوەن هەسـت و نەستانە منەتبار بکات و، ڕەزامەندی و خۆشەویستیی لە ئاستدا دەرببڕن..

هەروەها مامەڵەی ناسینێکی مەعنەویی گەرموگوڕ و بەکەرەم دەبینرێـت و، گفتوگـۆیەکی زمـانی حـاڵیش دەبیسـترێت کە خۆشـەویسـتی لە نێوانـدا دەردەخات و، قبووڵ و گیرابوونێکی میهرەبانانەش بـۆ دوعاکـان هەسـت پـێ دەکرێت.. کە ئەمانەش شەفەقەتێکی یەکجار قووڵ و میهرەبانییەکی گەلێ بەرز بۆ هەست و نەستی مرۆڤ دەردەخەن.

بەو واتایەی کە هەرچی ڕێزلێنانی "نیعمەتبەخشین" و "لەزەت پێ چەشـتن" لە پشـت ئەم خۆناسـاندن و خـۆ خۆشەویسـتکردنە ئاشـکرایەوە دەبیـنرێن، هەموویان لە ویستی شەفەقەتێکی لەوپەڕی ڕەسەنی و دامەزراوی و، لە حەزی میهرەبانییەکی لەوپەڕی هێز و فراوانییەوە سەرچاوەیان گرتووە..

جا بوونی ئەم چەشنە ویستە بەهێز و ڕەسەنەی شەفەقەت و میهرەبـانی لەو کەسەدا کە خاوەنی دەوڵەمەندیی ڕەهایە و هەرگیز پێویستی بە هیچ شتێك نییە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "جوانی"یەکی ئەزەلی و نەبڕاوە و هەمیشەیی لەوپەڕی "کەماڵ"دا هەیە کە هەرگیزاو هەرگیز هیچ شتێك لە وێنەی نییە.

یەکێك لە خواستەکانی ماهییەتی ئەم جوانییە سەرمەدی و هەمیشەییە ئەوەیە کە لە ئاوێنەکانـدا خـۆی ببینێـت و، لە لایەن خـاوەن هەستانیشـەوە ببینرێـت. هەروەها حەقیقەتەکەی داخوازی ئەوەیە کە بەرچاو بکەوێت. بە ڕادەیەك کە بۆ مەبەستی بینینی خۆی و پیشـاندانیشـی لە ئـاوێنە جۆراوجۆرەکانـدا، شـێوەی "میهرەبانی و شەفەقەت"ی لەخۆ گرتـووە و، لە ئـاوێنە خـاوەن هەستەکانیشـدا شـێوەی "چـاکە و نیعمەتبەخشـین"ی وەرگرتـووە و، پاشـان شـێوەی "خـۆ خۆشەویسـتکردن" و "خۆناسـاندن"ی پـێش چـاو خسـتووە و، ئنجـا نـوور و ڕووناکیی "جوانکردن" و "ڕازاندنەوە"ی بە سەرجەمی بوونەوەران بەخشیوە.

* سەرنجی دووهەم:

بوونی ئەوینێکی ئیلاهیـی گەرموگـوڕ و خۆشەویسـتییەکی پەروەردگـاریی بەهێـز لای مـرۆڤە لەژمارەبەدەرەکـان، بە تـایبەت لە چیـنە بەرزەکانیانـدا، هەرچەندەش ڕێبازەکانیان جیاجیا و جۆراوجـۆرە، بە ڕوونی و بەڵگەنەویسـتی ئاماژە بۆ "جوانی"یەکی بێ وێنە دەکات، بەڵکو شـایەتییەکی بێگومـانی لەسـەر دەدات.

بەڵێ، ئەم چەشنە ئەوینە داخوازی ئەو جوانییەیە و ڕووی لێیەتی. هەروەك ئەم جۆرە خۆشەویستییەش داواکاری ئەو جۆرە جـوانییەیە. بگـرە ئەو حەمـد و سەنا گشتییەی کە هەموو بوونەوەران چ بە زمانی حـاڵ و چ بە زمـانی گوفتـار دەری دەبڕن، تەنهـا ڕوویـان لەو جـوانییە ئەزەلیـیە کـردووە و، ڕووەو ئەو بەرز دەبنەوە..

تەنانەت هەرچـی جەزبە و شـەوق و کێشـێك لە سەرانسـەری گەردوونـدا هەیە و، هەموو ڕاستییە سەرنج ڕاکێشـەکانیش، تێکـڕا ئامـاژەن بـۆ ڕاسـتییەکی خاوەن کێش و جازیبەی ئەبەدی و ئەزەلی..

هەروەك خولانەوە و جموجـووڵی تەن و قەبـارە بەرز و نزمەکـانیش، کە بە وێنەی موریدێکی مەولەویی شەیدای ئەوتۆ بـۆ بیسـتنی "زیکـر" جەزبەی لـێ هاتبێت، ئەنجامی دەدات..

هەمـوو ئەمـانە، ڕاوەسـتانێکی عاشـقانەیە - لە دەمـی ئەنجامـدانی ئەرکی سەرشاندا - لە بەرامبەر دەرکەوتنی زاڵ و بەدەستەڵاتی "جوانیی موقەددەس"ی ئەو ڕاسـتییە خـاوەن کـێش و جـازیبەیەوە، وەك لای هەنـدێ شـەیدای وەك شەمسی تەبریزی[1] دەردەکەوێت.

* سەرنجی سێهەم:

هەموو لێکۆڵەرانی "ئەهلی تەحقیق" لەسەر ئەوە کۆك و یەکدەنگن کە:

"وجـوود" خێـر و ڕوونـاکییەکی سەرتاسـەرییە و، "عەدەم"یـش شـەڕ و تاریکییەکی تەواوەتییە.

هەروەها پێشەوایانی ئەهلی "دڵ" و "ژیـری" لە ئەنجـامی توێژینەوەکانیـان، لەسەر ئەوە یەکیان گرتووە کە:

هـەمـوو خێـر و چـاکە و جـوانی و لەزەتێـك لە "وجـوود"ەوە سـەریان هەڵداوە و، گشت شەڕ و گێروگرفـت و ئازارێـك، تەنـانەت گوناهەکـانیش لە "عەدەم"ەوە پەیدا بوون.

---

(١) ناوی شەمسەددینی کوڕی عەلیی کوڕی داوودی تەورێزییە و، بە "شـەمسـی تەبریـزی" نازناوی بڵاو بووەتەوە و، ڕابەر و هاوڕێی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمیـیە. سـاڵی (٦٤٥ك) لە دنیا دەرچووە و لە دوای خۆی دیوانێکی شـیعری فارسـیی بەجـێ هێشـتووە. بـڕوانە: هدیـة العارفین ٢/١٢٣؛ قاموس الأعلام ٤/٢٨٧٢. (وەرگێڕ)

**خۆ ئەگەر دەڵێیت:** چۆن "وجوود" بە سەرچاوەی هەمـوو شـتە جوانەکـان دادەنرێت، لە کاتێکدا کە "کوفر" و "خۆپەرستیی دەروون"ی تێدایە؟

**وەڵام:** هەرچـــی "کـــوفر"ە، ئەوا لەبەر ئەوەی کە بـــریتییە لە ئینکـــاری و نەفیکردنی ڕاستییەکانی ئیمان، ئەوا بە "عەدەم" دادەنرێت.

"بوون"ی "خۆویستیی مرۆڤ"یش لە ڕاستیدا هەر "عەدەم"ە، بەڵام شـێوەی "وجوود"ی لەخۆ گرتووە! چـونکە "خۆویسـتی" شـتی وەهمـی بە حەقـیقەتی ڕاستەقینە و واقیعی دەبینێت و، خۆی لە خۆیدا موڵکایەتییەکی ناڕاستەقینەیە و، ناشزانێت کە خۆی جگە لە ئاوێنە هیچی‌تر نییە.

جا مادەم سەرچاوەی هەموو جۆرەکانی جوانی "وجـوود"ە و، سـەرچاوەی هەمـــوو جۆرەکـــانی چەپەڵـــی و ناشـــیرینیش هەر "عەدەم"ە، ئەوا بێگومـــان بەهێزترین و بەرزتـرین و درەخشـانترین و دوورتـرین "وجـوود" لە "عەدەم"ەوە بـریتییە لە بـوون و وجـوودی خـوای گەورەی "واجـب الوجـود"ی ئەزەلی و ئەبەدی و، ئەم "بوون"ەش خوازیاری بەهێزترین و بەرزترین و درەخشـانترین و دوورترین "جـوانی"یە لەو قسـوور و نـاتەواوییە. بگـرە ئەو "بـوون"ە خـۆی لە خۆیـدا تەعبیـر لەم "جـوانی"یە دەکـات، تەنـانەت هەر خـۆی ئەو جـوانییەیە. چونکە هەروەك "خۆر" داخوازی "ڕووناکی"یەکەی دەوراندەوریەتی، "بوون"ی خواوەندی "واجب الوجود"یش داخوازی "جوانی"یەکی هەمیشەییە کە هەمـوو "وجوود"ی پێ ڕووناك بکاتەوە!

الحَمْدُ لِلّهِ عَلَى نِعْمَةِ الإيمان.

﴿رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ (البقرة:٢٨٦).

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ (البقرة:٣٢).

* * *

**تێبینی:**

نیازمان وابوو کە نۆ پلەی نووریی "حەسبی" بنووسرێت. بەڵام ئێستا لەبەر چەند هۆکارێك سێ پلەیان دواخرا.

**بێدارکردنەوەیەك:**

پەیامەکانی نوور، لەبەر ئەوەی تەفسیری قورئانی پیرۆزن و پشتیان بە بەڵگە گیراوە و لە قورئانەوە هەڵقوڵاون، ئەوا هەندێ دووپاتبوونەوەی پێویستیان لەبەر دانست و بەرژەوەندی تێدایە، بە وێنەی دووپاتبوونەوە ناسکەکانی قورئان کە سەرتاپا دانست و پێویستن و هەرگیز خوێنەر بێزار ناکەن.

هەروەها لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور بریتین لە بەڵگەکانی ئەو "وشەی تەوحید"ەی کە بە شەوق و زەوق و بێ هیچ بێزارییەك بەردەوام لەسەر زمانەکاندا دووپات دەبێتەوە، ئەوا دووپاتبوونەوە پێویستەکانی بە ناتەواوی دانانرێن و پشت بە خوا خوێنەر بێزار ناکەن[1].

* * *

(١) تێبینی:
دانەر لێرەدا بابی پێنجەمی بریسکەی عەرەبیی بیست و نۆهەمی بەبێ پەراوێزەکان هێناوە. کە لە بارەی پلەکانی ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ەوەیە. تکایە خوێنەری بەڕێز لە شوێنی ناوبراو لە کتێبی (بریسکەکان)دا سەیری بکات. لە نیازدایە کە بە پشتیوانیی خوای گەورە لە کتێبێکی سەربەخۆشدا بە ناوی "بیرکردنەوەی ئیمانیی بەرز" بڵاوی بکەینەوە. (وەرگێڕ)

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە .
* لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!
* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی "نوورس" نێژراون.
* چوارەم مناڵی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن:
(دوڕڕییە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).
* لە پێشدا لە لای "مەلا عەبدوڵڵا"ی برا گەورەی دەستی بە سەرەتاکانی خوێندن کردووە. پاشان چەندین گوند و شاری کوردستان گەڕاوە و، لای زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەست هێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا، فیزیا، بیۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.
* لەبەر زیرەکیی ناوازە و لە ڕادەبەدەری، نازناوی (سەعیدی مەشهوور) پاشان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و، کردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سەردەم شان بە شانی زانستە ئاینییەکان. لەم پێناوەشدا لە لایەن دواهەمین دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانییەوە ڕووبەڕووی چەندین گرفتی دژوار بووەتەوە.

* گەورەترین زانا و کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمەیە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی کورددا هەڵکەوتووە و، ناوبانگی جیهانیی بۆ دروست بووە و، لە ڕووبەرێکی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگیرێت.
* تاکە کەسایەتی بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی ڕژێمی مستەفا کەمال و، سی و پێنج ساڵی بەندی و دوورخستنەوە و دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆکی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی کۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێر ناونیشانی (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەکانی نوور بۆ (زمانی عەرەبی) لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە لە دە دانە بەرگی گەورەدا تەواو بووە و، لە وڵاتانی تورکیا و میسر و هیندستان و عەرەبستانی سعوودی چەند چاپێکی یەك لە دوای یەکیان تا ئێستا لێ بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان ماری وێڵد (شوکران واحیدە)وە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و بڵاو کراونەتەوە.
* بە (زمانی کوردی)ش (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)مان لە نۆ بەرگی گەورەدا چاپ کردووە، جگە لە سی و نۆ کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.
* چەندین کتێبی تر بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاوکراونەتەوە.
* چەند بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خوارەوەش وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە:
(ئەڵمانی، ئەلبانی، ئیتاڵی، ئیسپانی، ئازەری، ئۆزبەکی، ئوردوو، ئیندۆنیسی، بەنگالی، بولگاری، بۆسنی، پرتوگالی، پشتۆ، تاجیکی، تەتاری، تاڵشی، تورکمانی، جۆرجی، چینی، دانیمارکی، ڕۆمانی، ڕووسی، ژاپۆنی، سانسکریتی، سلۆڤاکی، سەواحیلی، سویدی، فەرەنسی، فیلیپینی، فارسی، ڤێتنامی، قەرغیزی، کازاخی، کۆری، کرواتی، گۆجیراتی، لاتینی، مالی، مالیزی، مەقەدۆنی، نەیجیری، هۆسا، هیبرۆ، هیندی، هەنگاری، هۆڵەندی، یۆنانی).
* تا ئێستا زیاتر لە شەست کۆنفرانسی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی

لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.
* لە وڵاتی هیندستان پەیمانگایەکی تایبەت بە ناساندنی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی دامەزراوە، کە خوێندن تیایدا بەردەوامە.
* دواهەمین گەورە کۆنفرانسی زانستیی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبووڵ لە بەرواری (١-٢٠١٧/١٠/٣ز)دا بەڕێوەچوو، کە زیاتر لە سەد توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا و، چەند توێژەرێکی باشووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە باشووری کوردستاندا، هەتا ئێستا سێ سیمینار ساز کراوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).
* هەروەها کۆڕبەندێك لە بەرواری (٢٠١٣/١٢/٢١ز) لە شاری هەولێر لە لایەن پەیمانگای زانستە ئیسلامییەکان و وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستانەوە ڕێکخرا بە بەشداریی چەند توێژەرێکی ناوخۆی کوردستان و وڵاتی تورکیا و، بە ئامادەبوونی دەیان کەسایەتیی زانستی و ئایینیی عێراق و هەرێم.
* هەروەها لە بەرواری (٢٠١٥/١٢/١٢ز)دا لە شاری هەولێر نەدوەیەکی زانستی لە لایەن (ڕێکخراوی پەیامی پاك)ەوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی ساز کرا بە ناوی "نووری نبووەت لە پەیامەکانی نووردا" کە چەند توێژەرێکی باکووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە بەرواری (٢٠١٦/٣/٢٦ز)شدا لە شاری هەولێر لە لایەن (ئەمینداریتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق) و بە بەشداریی سەنتەری ڕۆشنبیریی (وقف الخيرات) نەدوەیەکی ڕۆشنبیری بە ناوی (الإمام بديع الزمان سعيد النورسي ومنهجه في إحياء الإيمان) بەڕێوەچوو چەند باس و بابەتێکی بە زمانی عەرەبی تێدا پێشکەش کرا.
* دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە شاری سلێمانی لە ساڵی (٢٠١٦)دا ژمارە (٨٩)ی بڵاوکراوەی (ڕۆڤار)ی تایبەت کرد بە مامۆستا نوورسی بە ناوی (سەعید نوورسی.. کلیلی گەنجینەیەکی شاراوە).
* هەتا ئێستا لە باشووری کوردستاندا شەش مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك، هەولێر، پێنجوێن، هەڵەبجە).

# پێرستی بابەتەکان

بابەت | لاپەڕە

* * *

# خوای گەورەم بەسە

**ئەگەر دەتەوێ بزانیت:**

- "عیشقی مانەوە" لە ناخی مرۆڤدا ئاراستەی کێیە؟
- پەیوەندیی ئیمانی بە خوای گەورەوە، چی بە "مرۆڤ" دەبەخشێت؟
- گرنگیی مرۆڤ لە ڕووی "ئیمان"ەوە چییە؟
- "جوانیی بوونەوەران" لە خۆیانەوە پەیدا نەبووە، ئەی ئایا ئاوێنەی چ خاوەن جوانییەکە؟
- خاوێنترین چێژ و پوختترین بەختەوەریی "ژیان" لە چیدایە؟

ئەگەر دەتەوێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بزانیت، فەرموو بە شێنەیی ئەم کتێبە بخوێنەرەوە.

## حَسْبِيَ اللّٰهُ (جَلَّ جَلالُهُ)

من كليات رسائل النور

التي ألفها الأستاذ:

بديع الزمان سعيد النورسي

(رحمه الله)

## FOR US GOD SUFFICES

From

The Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi

0-0259-0000-5

9 780025 900004

نرخی (١٠٠٠) دیناره